# شەریعەتی، کێ بوو؟ چی گوت؟


**د. عەلی شەریعەتی**


ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە فارسییەوە :

**موسعەب ئەدهەم**


**چاپی یەکەم**

٢٠١٥

AWER
Nawendi Awer

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە:

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

❖ زنجیرەی بەرهەمەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتی (٥)
❖ ناوی کتێب : شەریعەتی، کێ بوو؟ چی گوت؟
❖ بابەت: وتار و گفتوگۆ
❖ نووسەر: کۆمەڵێك نووسەر
❖ وەرگێڕ: موسعەب ئەدهەم
❖ بەرگ: ئاکار
❖ دیزاینی ناوەوە: هەڵکەوت هەورامی
❖ پێداچوونەوەی: رێبوار کوردستانی
❖ ساڵی چاپ: ٢٠١٥
❖ نۆرەی چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٢٨٠) ساڵی (٢٠١٤) پێدراوە.



بۆ پەیوەندیکردن
musabadham@yahoo.com
facebook:mosabhazhan@yahoo.com

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان:هەولێر-پشت پارێزگا-بەرانبەر دەرگای قەڵات

ژمارەی مۆبایل: 07504209495 - 07504242101

ئیمەیڵ : Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووك: www.facebook.com/nawendi Awer

# ناوەڕۆک


- پێشکەش ........................................ ٥
- بەرایی ........................................ ٦
- ڕۆژژمێری شەریعەتی ........................................ ١٢
- وەسێتنامە ........................................ ١٦
- تایبەتمەندییەکانی کەسێتی پێغەمبەر "ص" ........................................ ٢٢
- خۆشەویستی، گەورەتر لە عیشق........................................ ٣٩
- شیعر ........................................ ٤٤
- ناساندنی بەرهەمەکان........................................ ٥٨
- بەرهەمەکانی بە زمانە جیاوازەکان ........................................ ٨١
- لەبارەی "شەریعەتی"یەوە........................................ ٩٤
- شەریعەتی، بیرمەندی ئازادی ........................................ ١٠٣
- "شەریعەتی" لە دیدگای "موستەفا مەلەکیان"ەوە ........................................ ١١٥
- "شەریعەتی" کێ بوو و چی وت؟ ........................................ ١٢٥
- "شەریعەتی"، بت نیە ........................................ ١٣٤
- لە نێوان دوالیزمەکانی تراژیدیادا ........................................ ١٤٢
- بەرهەمەکانی وەرگێڕ ........................................ ١٥٥
- ئەو بەرهەمانەی لەبەردەستدان........................................ ١٥٧

## دكتۆر عەلی شەریعەتی

## پیاوێک هێشتاش لە ئاسمانی دونیای رۆشنبیریدا دەدرەوشێتەوە

بە داخەوە بۆ ئێمەی کورد "شەریعەتی" هێشتا ناسراو نیە بەو جۆرەی کە پێویستە، چونکە ئێران وەکو ولاتێکی دراوسێمان و بە هۆی نزیکی فەرهەنگی و کلتوریمان بەیەکەوە، دەبوو ئاگاداری رۆشنبیری ئەو ولاتە بین کە تەژیە لە شتی گەلەك جوان و سەرنج راکێش و چەندین عارف و فەیلەسوف و ناوداری تێدا هەلکەوتووە، لە سەردەمی نوێشدا چەندین رۆشنبیر و بیرمەند گەرچی هەندێکیان بە داخەوە لە دەرەوەی ولاتەکەیانن، بونەتە جێگەی سەرنجی دونیای دەرەوە و ئەوروپا و جیهان بەگشتی سوودیان لێوەر دەگرێت و لە زانکۆ و سیمینارە نیو نەتەوەییەکاندا کۆڕیان بۆ دەگیرێت و زانکۆ بەناوبانگەکان بانگهێشتیان دەکەن، لە کاتێکدا ئێمەی کورد و دونیای رۆشنبیریمان چەندین فەیلەسوف و بیرمەندی دیکەمان پێ دەناسێنن کە نەك هەر لە رووی فەرهەنگی و کلتوریەوە لێك نزیك نین، بەلکو بۆچوون و تێزەکانیشیان چەندین فەرسەخ لە دونیا رۆشنبیری و فەرهەنگی و کوردیمانەوە دوورن.

"شەریعەتی" هەرچەندە لە ولاتەکەی خۆیدا و لە دەرەوەش لە ناساندن و ناسێنراوی دەرچووە و رەخنەی لێ دەگیرێت و ناتەواوی و کەموکوری لە هزر و ئەندێشەکانی دەخرێتەڕوو کە ئەمە بۆ هەر بیرمەند و فەیلەسوفێکی تریش هەم راستە و هەمیش ئاسابیە، بەلام هێشتاش لای ئێمەی نەتەوەی کورد نەناسراوە

هەرچەندەش لە رابردوودا کەسانی وەکو "مامۆستا هەژار موکریانی" و "مامۆستا سەدیق بۆرەکەیی" چەند شتێکی ئەم بیرمەندەیان بۆ زمانی شیرینی کوردی وەرگێڕراوە لە ئێستاشدا تارادەیەك خەریکە بەرهەمەکانی دی بە خوێنەری کورد ئاشنا دەکرێن.

شەریعەتی لە سالّی (١٣١٢– ١٩٣٣ز) لە خێزانێکی مەزهەبی چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، باوکی "موحەممەد تەقی شەریعەتی" پیاوێکی زانا و خواناس بووە و مامۆستای زانکۆی "مەشهەد" بووە. شەریعەتی پاش ئەوەی دەچێتە زانکۆی ئەدەبیات و زانستە مرۆییەکانی زانکۆی "مەشهەد" و بەشی ئەدەبیاتی فارسی دەخوێنێت، هەرلە هەمان سالّدا لەگەلّ یەکێك لە هاوپۆلەکانیدا بەناوی "پوران شەریعەت رەزەوی" هاوسەرگیری دەکات. بوونی بیرکردنەوەی داهێنانکاری بوویە هۆی ئەوەی "د. شەریعەتی" بە درێژایی قۆناغی خوێندنی زانکۆیی کاری لەسەر بەرهەم گەلی وەکو وەرگێڕانی "ئەبوزەری غەففاری"، وەرگێڕانی "نزا"، بەرهەمی "د. ئەلیکسس کارل" و هەروەها کۆمەلّێك وتار و لێکۆلّینەوەی تری نووسی. بەهۆی ئەوەی لە بەشەکەیدا یەکەم بوو بۆ تەواوکردنی خوێندن بۆ "فەرەنسا" نێردراوە. لەوێ دەستی کردوە بە خوێندنی زانستەکانی وەکو: کۆمەلّناسی، بنەماکانی زانستی مێژوو و مێژوو و فەرهەنگی ئیسلامی و لەگەلّ مامۆستاگەلی مەزنی وەکو: (ماسینون، گورویچ و سارتەر و ...هتد) ئاشنا بووە و سوودی لێوەرگرتوون. هەلّبەتە چەند وتار و نووسینێکی "سارتەر" و نوسەرانی تری وەرگێڕاوە و بلاّوی کردونەتەوە. پاشان ئەوەی دکتۆرا لە کۆمەلّناسی و مێژووی ئایینەکان وەردەگرێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئێران. لەو سەردەمەشدا بەرگری لەو بزوتنەوەیە دەکات کە لە ئێراندا بە سەرۆکایەتی "موسەددیق" چالاکی نواندوە و پشگیری خۆی لەم بزوتنەوەیە دەکات. دوای ماوەیەکی زۆر دەبێتە مامۆستای

زانکۆی "مەشهەد" و لە ساڵی (١٣٤٨)دا بانگ دەکرێت بۆ "حوسێنیەی ئیرشاد" و بە خێرایی بەرپرسیاریەتی کاروباری فەرهەنگی ئەم حوسێنیە و دەست بە وتنەوەی کۆمەڵناسی مەزهەبی، مێژووی شیعە و زانستە ئیسلامیەکان دەکات و لە ماوەیەکی کەمدا سەرنجی بیسەران و کەسانی بەشداربووی ئەو دامەزراوە رادەکێشێت.

هێزی قسەکردن و نووسینی "د. شەریعەتی" هێندە کاریگەر و جێگای سەرنجی بیسەران و خوێنەرانی بووە کە لێکۆڵەرێکی "موحەممەد ئەسفەندیاری" دەنووسێت: ژمارەی ئەو خوێندکارانەی زانکۆ ناوی خۆیان لە وانەکانیدا تۆمار کردبوو گەیشتۆتە زیاتر لە (٥٠٠٠) پەنجاهەزار خوێندکار، هەروەها کۆی ئەو نوسینانەی لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا چاپ و بلاوکراونەتەوە گەیشتۆتە (١٥) ملیۆن نوسخە و کتێبی "ویلایەت"ی زیاتر لە (١٠٠٠٠٠) یەك ملیۆن نوسخەی لێ بلاوکراوەتەوە. "هاشمی رەفسنجانی" بە مامۆستایەکی بنەڕەتی و سەرەکی دەزانێت لە شۆرشی ئێراندا، هەروەك کەسێکی وەکو "د. موستەفا چەمران" کە سەرکردەیەکی ئەوکات و کەسێکی دیار بووە، وتویەتی هاوڕێی سەرەکیم لە باشووری لوبنان بۆ رووبەڕووبوونەوەی جولەکە کتێبی "بیابان"ی"شەریعەتی" بوو.

نووسینەکانی "د. شەریعەتی" وەك خۆی دەڵێت: بۆ سێ جۆر نووسین دابەش بوون، یان لە سێ بوار و کایەدا، ئەوانیش:

١- ئیسلامیات: بابەتە ئایینیەکان، نموونەی ئەمانەش: کتێبی ئیسلامناسی، حەج، نیایش و ...هتد

٢- اجتماعیات: بابەتە ئەکادیمی و زانستیەکان دەگرێتەوە و نموونەی ئەمانەش: بابەتەکانی کۆمەڵناسی و فەلسەفەی مێژوو و تەشەیوع و...هتد.

٣- کویریات: بابەتە عیرفانی و ئەدەبیەکان دەگرێتەوە، نموونەی ئەمانەش: گفتوگۆکانی تەنیایی، نیشتنەوە لە بیابان، و ... هتد.

"د. شەریعەتی" لەبارەی ئەم سێ جۆر بەرهەمانەی دەڵێت: ئەگەر پێم بڵێن کامەیان باشترینە و کام بخوێنرێتەوە، ئەوا دەڵێم: ئەگەر بۆ خەڵکی و خەڵکە گشتیەکە بێت، "ئیسلامناسی"، گەر بۆ کەسانی تایبەت و خوێنەری دەستەبژێریش بێت، ئەوا دەڵێم: "نیشتنەوە لە بیابان"، چونکە هەموو کەس بەرگەی ووشکی و ترس و حیرەت و بای بیابان ناگرێت و نایەوێت بەو جۆرە بژی.

"شەریعەتی" پاش ئەوەی فشارێکی زۆری لەسەر بوو لە لایەن حکومەتی شای ئەوکاتەی ئێران، ئیدی ساڵی (١٩٧٧)زایینی بەرەو "بەریتانیا" کۆچ دەکات و هەر ئەو شەوەی دەگاتە "لەندەن"ی پایتەختی "بەریتانیا" بۆ سبەی بەیانی لە تەمەنی (٤٣) ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات، هەرچەندە هەندێك پێیان وایە و زۆرترین بۆچوون جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بە پیلانی رژێمی "شا" مردوە، بەڵام ئەمە گومانە بەو پێیەی لەم کتێبەدا نووسینێکی بیرمەند و رۆشنبیری ناودار"د.عبدالکریم سروش" مان وەرگێڕاوە کە هەمووی باسی چۆنیەتی مردنەکەی دەکات و خودی خۆی لەو کاتەدا لەوێ بووە و ئاگاداری چۆنیەتی مردن و بەشداربوویەکی شۆردنی تەرمەکەی و ئاگاداری ناردنەوەی تەرمەکەی بۆ "سوریا" بووە.

کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پاشانیش بڵاوکردنەوەی لەو روەوە بوو پێشتر ئاماژەمان پێدا تاکو خوێنەری ئێمەش ئاشنای تیژ و بۆچوون و تەنانەت ئەو رەخنانەش بێت لێی گیراوە، هەڵبەتە دەبوو لەوە دەوڵەمەندتر بوایە کە ئێستا هەیە، بەڵام هێندە لە توانای ئێمەدا بوو، هەرچەندە هەوڵمان دا زێدەتر لەوە بێت کە ئێستا هەیە بەو پێیەی لەگەڵ خوشکی ئازیزم "فاتیمەخان" پەیوەندیمان کرد

بە کوڕی گەورەی مەرحوم "د. شەریعەتی" کە ناوی "د. ئیحسان شەریعەتی"یە و هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە فەلسەفەدا و هەروەها هەردوو کچی "د.سارا شەریعەتی" و "د. سەوسەن شەریعەتی" کە نەك لەبەرئەوەی منداڵی "د.شەریعەتی"ین، بەڵکو لەبەرئەوەی کەسانی بەتوانا و دیارن هەم نووسینیان هەیە و هەمیش لە زانکۆکاکانی ئێراندا وانە دەڵێنەوە، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا چاوەڕوانین و خودا یار بێت گەر لە داهاتوودا وەڵام و نووسینی ئەوانمان بە دەست بگات، بێگومان بڵاوی دەکەینەوە.

دواجار لەم کتێبەدا کەمتر ویستومانە بابەتەکانی "شەریعەتی" بۆ زمانی کوردی وەربگێڕین، هێندەی نیازمان بووە بیناسێنین و خاکەڕاییانە پەنجەرەیەك بەرووی دونیا جوانەکەی ئەم بیرمەندە ناودار و ناوازەیە والآ بکەین.

**موسعەب ئەدهەم**

**٣-٢-٢٠١٤- سلێمانی**

---

**تێبینی:** بۆ زانیاریەکانی نێو ئەم وتارە سوود لە ئەنتەرنێت، "ویکیپیدیای عەرەبی" وەرگیراوە.

## رۆژمێری دکتۆر عەلی شەریعەتی

1312 لە دایکبوونی لە مانگی ئازەر لە لادێی "کاهەك"

١٣١٩ رۆیشتن بۆ قوتابخانەی "ئیبن یەمین"

١٣٢٥ رۆیشتن بۆ خوێندنگەی "فیردەوسی مەشهەد"

١٣٢٧ بوون بە ئەندام لە "کانونی نشر حقایق ئیسلامی"

١٣٢٩ رۆیشتن بۆ پێش زانکۆیی "مەشهەد"

١٣٣١ تەواوکردنی قۆناغی پێش زانکۆیی و خزمەتکردن لە ئیدارەی "فەرهەنگی مەشهەد".
بونیاتنانی ئەنجومەنی ئیسلامی فێرخوازان.
بەشداری کردن لە راپەرینی شەقام دژی حکومەتی کاتی و دەستگیرکردنی بۆ ماوەیەکی کورت.

١٣٣٢ ئەندامبوون لە راپەرینی بەرگری نەتەوەیی

١٣٣٣ وەرگرتنی دیبلۆمی ئەدەبی.
بلاوکردنەوەی کتێبی "تەرجەمە"، بەرهەمی "کاشف الغگاو"

١٣٣٤ بلاوکردنەوەی کتێبەکانی "ئەبوزەری غەفاری" و

"مێژووی تەواوکاری فەلسەفە"

ڕۆیشتن بۆ زانکۆی ئەدەبیاتی "مەشهەد"

١٣٣٦ دەستگیرکردنی لەگەڵ (١٦) کەس لە ئەندامانی ڕاپەڕینی بەرگری لە "مەشهەد".

١٣٣٧ تەواوکردنی زانکۆی ئەدەبیات بە پلەی یەکەم.

هاوسەرگیری لەگەڵ هاوپۆلێکی خۆی بەناوی "بی بی فاتیمە"، (شەریعەت ڕەزەوی).

١٣٣٨ سەفەرکردن بۆ فەرنسا و ناردنی بۆ خوێندن لە لایەن حکومەتەوە بەهۆی پلەی یەکەمەوە.

لە دایکبوونی یەکەمین منداڵی بەناوی "ئیحسان".

پەیوەندیکردن بە ڕێکخراوی ئازادیبەخشی "جەزائیر".

١٣٣٩ سەفەری هاوسەر و منداڵەکەی و بەیەکگەیشتنیان لەگەڵ "شەریعەتی".

زیندانیکردنی لە پاریس بەهۆی خەباتەکانی لە ڕێگەی ئازادی "جەزائیر"

١٣٤٠ هاوکاریکردنی لەگەڵ کۆنفیدراسیۆنی فێرخوازانی ئێرانی، سەنگەری نەتەوەیی، ڕاپەڕینی ئازادی و بڵاوکراوەی ئێرانی ئازاد.

١٣٤١ مەرگی دایکی

لە دایکبوونی دووەمین منداڵی بەناوی "سەوسەن".

ئاشنایی لەگەڵ بیرۆکەکانی "فانون"، نوسەری

شۆڕشـــگێڕی و ئەنـــدامی ســـەنگەری ڕزگاریبەخشـــی "جـــەزائیر" و کتێبـــی "دۆزەخیـــانی ڕووی زەوی".
ئاشنابوون بە "جان پۆل سارتەر".

١٣٤٢ لە دایکبوونی سێیەمین منداڵی بەناوی "سارا".
تەواوکردنی خوێندن و بەدەستهێنانی پلـەی دکتـۆرا لـە بەشی "مێژوو" و تێپەڕاندنی پۆلەکانی کۆمەڵناسی.

١٣٤٣ گەڕانـەوە بـۆ "ئێـران" و دەسـتگیرکردنی لـە سـنوور و گواستنەوەی بۆ زیندانی "قزل قەلعە"
کۆتایی هاتنی خزمەت و وەرگرتنـی پۆسـت بـۆ جـارێکی تر لە ئیدارەی فەرهەنگی.

١٣٤٤ گواسـتنەوەی بـۆ "تـاران" بـە ناونیشـانی کارنـاس و توێژینەوەی کتێبی خوێندن.

١٣٤٥ مامۆسـتای یاردەتیـدەر لـە بەشـی مێـژوو لـە زانکـۆی "مەشهەد"

١٣٤٧ دەست پێکردنی وتارەکانی لە "حوسـێنیەی ئیرشـاد" و زانکۆکان.
بلاوکردنـەوەی کتێبـەکانی "ئیسلامناسـی مەشـهەد" و کۆبەرهەمی (٣٠) و "لە کۆچەوە تاکو وەفات".

١٣٥٠ لە دایکبوونی چوارەمین منداڵی بەناوی "مونا"

١٣٥١ داخســتنی "حوســێنیەی ئیرشـــاد" و قەدەغــەکردنی وتاردان.

١٣٥٢ ناساندنی خۆی بە "ساواک" و (١٨) مانگ زینـدانیکردنی تاکەکەسی لە کۆمیتەی "شەهربانی"

١٣٥٤ خانەنشینی و سەرەتای ژیانێکی سـەخت لـە "تـاران" و "مەشهەد".

١٣٥٦ کۆچکردن بۆ ئەورووپا و مردنی.

## دەقی تەواوی وەسێتنامەی

## دکتۆر عەلی شەریعەتی

ئەمڕۆ دووشەممە، سیانزەهەمی مانگی بەهمەن، پاش هەفتەیەك رەنج و ئازاری بێهودە و دیدار و بینینی روخسارگەلی بێهودەتر، کەسایەتی پلەدار، پاسپۆرتەکەم وەرگرتەوە و بۆ چوار شەممە جێگەم ئامادە کرد و وتیان چواری پاش نیوەڕۆ لە فرۆکەخانە ئامادە بن کە رەنگە هەشتی ئێوارە بڕۆین. نیشانەکانی هەلگرتنی سەدەی بیستەم بەسەر کۆمەڵێکدا (کە بۆ سەدەی بوق دەگەڕێنەوە). گەرچی هێشتا لە ئێستاوە تاکو سنوور، ئیحتیمالاتی زەمینی و ئاسمانی گەلێك زۆرن، بەڵام وەکو حوکمی رووکەشی کاروبارەکان، بە نیازی سەفەرم و بە حوکمی شەرع، دەبێت لەم سەفەرەدا وەسیەت بکەم. وەسیەتی مامۆستایەك کە لە هەژدە ساڵیەوە تاکو ئەمڕۆ کە لە (٣٥) ساڵیدایە، جگە لە فێرکردن کارێکی دیکەی نەکردوە و جگە رەنج و ئازار شتێکی نەدوریوەتەوە، چی دەبێت!؟ جگە لەوەی هەموو قەرزەکانم لە کەسەکان و لە بانکەکان بەو پەڕی سەخاوەت و بێ درێغیکردن بە تەواوی بدەمەوە بە هاوسەرەکەم کە لە مافەکانم (ئەگەر پاش وەفات نەیانبڕین) و مافەکان و فرۆشی کتێبەکان و نووسینەکانم و ئەوەی هەمە و نیمە، بداتەوە. هەروەك خۆی دەزانێت بە شێوەیەکی وورد پێویست ناکات.

هەموو ئومێدێکم بە "ئیحسان"ە لە پلەی یەکەمدا و بە دوو کچەکەم لە پلەی دووەمدا. ئەوەی کە ئەم دوانەم بە پلەی دووەم هێنا، لەبەرخاتری کچ بوونی ئەوان و ئومێدەواربوونی من نیە. بەڵکو لەبەرئەوەیە لە هەلومەرجی ئێستای کۆمەڵگەی ئێمەدا، کچ چانسی وەکو حیسابکردنی وەکو مرۆڤ زۆر کەمە، دوو رێگەی زیاتریشی لەبەردەمدا نیە و بە دەستەواژەی دروستتر دوو شێواز و رێگە: یەکێکیان مانەوەی لە ماڵدا هەروەك قەلەرەشی شوم و قیرەقیرکردنی ناشیرین و و نەفرەتاری شێتانە ژیان، کەواتە ژنی ماقوڵی ئایینداو و یان هەموو بەها بالاْ بەرزەکانی تەواو ببن لە نزمایی ئەندامەکانیدا و بوکە شووشەیەك بۆ یاریکردنی شێتەکان و یان کالاْیەك بۆ بازاڕی کاری مۆدێرن و بە کورتی دەزگایەك بۆ بەکارهێنانی کالاْ سەرمایەداریەکانی بێگانەبوون، واتە ژنی رۆشنبیری نوێگەر. ئەم دوانەش یەك شتن، گەرچی دوور ووی دژبەیەکیشن. بەلاْم کاتێك کەسێك لە مرۆڤبوون دەچێتە دەرەوە، ئیدی چ جیاوازییەکی هەیە کوندەپەیوو بێت یان بێچوە کوندەپەپویەك. دەفرێکی ئاو بێت یان مێزی ئارایشتێك. ببێتە مێزی ئارایشێکی رۆژهەلاْتی، یان مێزی ئارایشێکی بێگانە. پاشان لەبەرامبەر ئەم تەنها دوو گومڕاکەر کە لەبەردەم پێی کچاندایە، چارەنووسی ئەو کچانەی لە باوك بێبەشن تاکو چ سنورێك دەتوانێت پەرجو ئاسا و سەردەم شکێن بێت و منداڵێك تەنها لەم شەپۆلە توندەدا، ئەم شەپۆلە پیسە کە هێندە پڕ توانایە بەرەوخوار بە تەلاْقەوە دەچێت بەناودا تاکو چ شوێنێك دەتوانێت بە پێچەوانەوە مەلە بکات و رێڕەوێکی دیکە هەڵبژێرێت؟

گەرچی ئومێدەوارم هەندێجار لە رۆحە سەروو ئاساییەکان، پەرجوویەکی لەمجۆرە سەری دەرهێناوە. "پەروینی ئیعتیصامی" هەر لەم خوێندنگە کچانەوە هاتۆتە دەرەوە و "موهەندس مەهدی بازرگان" هەر لەم زانکۆیانە و دکتۆر "سەحابی" لە

نێوان ئـەم بێگانانـە و "موسـەددیق" لـە نێـوان ئـەم دەوڵەتانـە و دەسـەڵاتانەی ﴿صلصال کالفخار، من حماء مسنون﴾، و "ئەنیشـتاین" هـەر لـەم نـەژاد پیسـانە کە حیسابە زانستیەکانی و "شوایتزر" هەر لەم ئەوروپیە مرۆڤخۆرانە و "لومومبا" هەر لەم بەندە نەژادانە و "مهر اوە پاك" هەر لەم پیسە هیندیانە و باوکم هەر لەم قوتابخانـەی ئاخوندانـە و بـە هـەرحاڵ مـرۆڤ لـە قـوڕی شـێلراو و "ئیـبراهیم" لـە "ئازەری" بت تاش و ... "محمد"(ص) لە خانەدانی بتخانەدار، ئومێد بە دڵی مـن دەدەن کە حیسابە زانستیەکانی مێشکی من بە هەنـد وەرنـەگرێت و ئومێـدەوار بم بە چارەنووسی منداڵەکانم لەم قـوڕاوی بـت پـەرستی و بـت تاشـینەدا کـە هـەموو پـەردەکانی بتخانـە پـەروەردە دەکـات. حـەزم دەکـرد "ئیحسـان"، بیرمەنـد، مەعنـەوی، پـڕ هەسـت، خۆبەکـەمزان، سـەرکەش و سـەربەخۆ بـە بـار بێـت. زۆر دەترسم لە هیچی و پوچ شەپۆلە نوێکـان و هـەرزان فرۆشـی و حـیرص و نۆکـەری ئەم خواجەیە، تاکو پلە و پایەی وەچەی سەردەم و گرێکان و حەسودییەکان و بە بێخودی ئەم رۆشنبیرە سیاسیانە، کە تاکو نیوە شەوان لە ماڵی هاوڕێیان یان لـە پشتی مێزی ئابجۆ فرۆشەکان لەو کەسانەی کە بە هـەرحاڵ کارێـك دەکـەن و بـەد گـۆیی دەکـەن و لەگـەڵ "فیـدڵ کاسـترۆ" و "ماوتسـۆتونگ" و "گیڤـارا" هەڵدەسەنگێنن و و بە سروشت مەحکومی دەکەن و پاش حەوت، هەشـت کاتـژمێر لە تەلەفۆنە شۆڕشگێڕەکان و کار توندەکان و گرێ سیاسیەکان، بە دڵێکی پـڕ لـە رازیبوون لە چاك شیکارکردنی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان کە سەدەی ئێسـتا لەگەڵیـدا دەرگیرە و تەرحکردنی راست و دروستی بابەتەکان، بەو جۆرەی کە بە عەقڵ هـیچ کەسێکی تر ناگات، بەرەو ماڵـەوە دەگەڕێنـەوە و بـە حاڵـەتێکی هاوشـێوە بەچـە گوارا و لە قاڵبی شێوە "لینین" لە ژێر کورسی دەخەون. هەروەها دەترسـم ببێتـە کەسێکی لەم جۆرە: بەهۆی گۆڤارە مانگانەکانەوە، بوونگەرا و مارکسی و ...هتـد بێت و بەهۆی هەواڵی دەرەکی رادیۆ و رۆژنامە، موفەسیری سیاسی و لەسەر رووی

فیلمە وەرگێڕدراوەکان بۆ فارسی، ئەمڕۆیی و ئەورووپی و بە هۆی وتارەکان و وێنە هەواڵیەکانی گۆڤارە هەفتانەییەکان و هەروەها بینیی گەڕیدە بێگانەکان کە لە شەقامی شارەوە تێدەپەڕن، پوچگەرا، هیپی و ئەنارشیست یان تەنها قسەکانی بیست ساڵ پیش ئێستای حەوزەکانی کرێکارانی حیزبی تودە، ماتریالیست و سۆشیالیستی چەپ و بە هۆی کتێبەکانی "طرح نو"، (ئیسلام و هاروسەرگیری)، (ئیسلام و کۆمەڵگە)، (ئیسلام و جیماع)، ئیسلام و فلان شت و ...هتد ئیسلامناس و بەهۆی ئەنجومەنی پەروەردەی بیرۆکەی قۆناغەکانی بیست ساڵە، رۆشنبیری دژی خورافات و بەهۆی کتێبی (چی دەزانم)، لەبارەی ئەو وولاتانەی لە دواکەوتندان، پسپۆڕی ئەو وولاتانە بێت لە حاڵەتی گەشەکردندان و بەهۆی وەرگێرانە هەڵە و بێماناکانی شیعر و ئەدەب و مۆسیقا و شانۆ و هونەری ئەمڕۆ، ببێتە خاوەن بۆچوون و قسەکەر دژی مرۆڤایەتی و هەرزەگۆیانی نەخۆشی هیرۆئینگەرایانی ووشك کە واتە "رەخنەگر" و شاعیری نوێگەر...

بە کورتی من بە ئەو "چی بوون" فەرز ناکەم. ئەو ئازادە. ئەو خۆی دەبێت خۆی هەڵبژێرێت. من کەسێکی بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیست"م، هەڵبەتە بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیزم"ی تایبەتی خۆم، نەك دووبارەکردنەوە "تکرار" تەقلید و وەرگێرانی ترجمە" کە لەم سێ "ت" ناشیرینە هەمیشە بێزارم. بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە لەو "ت"یەی تر، "تقی زادە و "مێژوو "تاریخ".

لەبارەی ئامۆژگاریشەوە هیچ کات لە هیچ کەسەوە وەرم نەگرتووە و هیچ کاتیش ئامۆژگاری هیچ کەسم نەکردوە. هەر بەشێك بخوازێن دەتوانێت هەڵی بژێرێت، بەلام لە هەڵبژاردنیدا، دەبێت بەهای فیکری و مەعنەوی پێوەری هەڵبژاردن بێت، نەك بوونی بازاڕ و گران کرینی. من دەمزانی لە جیاتی کارکردن لە فەلسەفە و

کۆمەڵناسی و مێژوودا، ئەگەر ئارایشتم بخوێندایە یان بانکدار یان گاوداری و تەنانەت کۆمەڵناسێکی بەکەڵك (بەو جۆرەی کە کۆمەڵناسانی نوێی ئێمە لەسەر ئەوەن کە فلان دێ یان دامەزراوە یان پرۆژە (اتود) ئەنجام دەدەن و بە رێککەوت بە هەمان ئەو ئەنجامە زانستیانە دەگەن کە خاوەن کار پێی وتون و داینـاوە)، ئەمڕۆ وەسیەتنامەکەم لە جیاتی دراشتنێکی ئەدەبی، بوو بوویە شتێکی سادە، باسم لە بەش و موڵك و شت و مەکی ناوماڵ و بازاڕ و کارگەکان و دام و دەزگا کە دەبوو دیاریم بکردنیایە چەندن وەکو ئێستا، لە جیاتی قەڵەمەکان، وتنەکانم ریز نەکردن، بەڵام لە دەرەوەی هەموو قسەکانی تر، ئەگەر پێوەر بکەینە گەڕان بە دوای چێژدا و بەمە دیاری بکەین، مەگە چێژی بیرکردنەوە، چێژی قسەیەکی داهێنەرانە، شیعرێکی هەژێنەر، چێژی جوانیەکانی هەست و تێگەیشتن و مەگەر بەهای هەندێك لە ووشەکان لە چێژی بوونی حیسابێکی هەبوو یان فلان قەباڵەی دانیشتنێك کەمترە ! ؟ چ مشك مرۆڤانێك کە تەنها لە یاریکردن لەگەل دراو لە ژیاندا چێژ وەردەگرن و چ گا مرۆڤانێك کە تەنها لە ئاخوڕی ئاوایی و هەروەها لە سێبەی درەختدا قەڵەو دەبن.

من ئەگەر خۆم بوومایە و خودی خۆم، فەلسەفە و هونەرم دەخوێند. تەنها ئەم دوانەن دونیایان بۆ من هەیە. خۆراکم فەلسەفە و شەرابم هونەر و ئیدی بەسە ! بەڵام من لەسەرەتاوە متاهل بووم. ناچار دەبوو کارم بۆ خێزانەکەم بکردایە و بۆ ژیانی ئەوان دەژیام. ناچار کۆمەڵناسی مەزهەبی و کۆمەڵناسی کۆمەڵگەی موسوڵمانان کە بە پێی توانای کەمم، رەنگە بۆ خەڵکەکەم کارێکم ئەنجام دابێت، بۆ خێزانی برسی و تینوو و خاوەن پێداویستی و بێکەس، گۆزەیەك ئاوم هێنا بێت.

ئەو ئازادە کە یان خۆی هەڵبژێرێت و یان خەڵکی، بەڵام هەرگیز نەك شتێکی تر، کە جگە لەم دوانە هیچ شتێك لە جیهاندا بەهای ئەوەی نیە هەڵبـژێردرێت، پیسـە، پیس کورِم! تۆ دەتوانی "هەر جۆر بوون" ێك کە بتەوێ، ببیت، هەڵبژێری. بـەڵام ئازادی هەڵبژاردنی تۆ لە چوار چێوەی سنووری مرۆڤبووندا سـنووردراوە و دەورە دراوە. لەگەڵ هەر هەڵبژاردنێکدا دەبێـت مرۆڤبـوونی لەگەڵدا بێـت و گـەرنا ئیـدی قسـەکردن لـە بـارەی ئـازادی و هەڵبژاردنـەوە، بـێ مانایـە، چـونکە ئـەم ووشـانە تایبەتی خودان و مرۆڤ، ئیدی هیچ کەس، هیچ شتێك.

مرۆڤبوون مانای چیە؟ مرۆڤ بوونەوەرێکە کە ئاگایی هەیـە (بـە خـۆی و جیهـان) و دروست دەکات (خۆی و جیهان) و دەمارگیری هەیـە و دەپەرۆسـتێت و چاوەروانی دەکێشێت و هەمیشە گەریدە و بەدوای رەها "مگلق"ەوەیە. گەریدەی رەها. ئەمە زۆر مانای هەیە. خۆشگوزەرانی، خۆشبەختی، سەرکەوتنە رۆژانەییـەکانی ژیـان و زۆر شـتی تـر لێـی دەدات. ئەگـەر سـیفەتانە بەبەشـێکی بـوونی مـرۆڤ بـزانین، چ ترسـناکە کـە دەبیـنین لـەم ژیانـە مەسرەفیەدا و ئـەم شارسـتانیەتی ملمڵانـێ و چاودێری و سـووربوون لەسـەر شـت و بەشـداربوون و هـەبوون، هـەمووی دەروات. مـرۆڤ لـە ژێـر بـاری قورسـی سـەرکەوتنەکتنیدا دەیـەوێت بسـرِدرێتەوە، زانسـتی ئەمرِۆی مرۆڤ دەیەوێت بۆ ئاژەڵێکی بەهێز بیگۆرِێت. تـۆ دەتـەوێت هەرچـی بیـت، ببە. بەڵام...مرۆڤ بە.

ئەگەر پیادەیت، سەفەر بکە. لە مانەوەدا دەگەنیت، کۆچ "هیجـرەت" ووشـەیەکی گەورە لە مێژووی "بوون"ی مرۆڤەکان و شارستانیەتەکانە. ئەوروپا ببینـە. بـەڵام ئـەو کاتـەی ئێرانـت بینیبێـت، گـەرنا کـوێر رۆیشـتویت و کـەرِ گەرِاویتەتـەوە. "ئـەفریقا" بـەیتی دووەمـی ئـەو بەیتەیـە کـە بـەیتی یەکـەمی "ئەوروپا"یـە، لـە ئەوروپادا وەکو زۆربەی رۆژهەڵاتیەکان لە نێـوان ریسـتۆرانت و مـاڵ و کتێبخانـەدا

زیندان مەبە. ئەمە سێ گۆشەیەکی خراپە. ئەم زیندانە سێ گۆشەی هەموو بێگانە رۆیشتوەکانی ئێمەیە. لەو زۆرینەیەی کە کاتێك لەم زیندانەوە دێ،ە دەرەوە و پێیەکانیان دەخەنە ناو ئەورووپاوە، سەریان لە پاشەڕۆی شارەوە دەهێننە دەرەوە، قسەیەك نالێم کە حەیف لە قسەکردنەوەیە! ئەمانە زۆربەیان پیرەژنان و پیرەپیاوانی دەرەوە و هەڵبژاردنی کچانی دەرەوەی بێگانەیان لەگەڵ دەقی راستەقینەی ئەورووپا گۆڕیوەتەوە. چەند مرۆڤ گەلێکم بینی کە بیست ساڵ لە "فەرەنسا" ژیاون و لەگەڵ "فەرەنسی"یەکدا ئاشنا نەبوون. فلاّن "ئەمریکی" کە دێت بۆ تاران و لە لایەن مشکەکانی باکوری شار و خێزانەکانی "قرتی لوس"ی ئەشرافی پیس، عەنتەری بێگانە دەوری دەدرێت، تاکو چ رادیەك ژینگەی خێزانی ئێرانی و رۆحی جادەی رۆژهەلاّت و هەزاران پەیوەندی نادیار و جوانی مرۆیی تایبەتی نەتەوەی هەست پێکردوە؟

گەر رۆیشتی بۆ ئەورووپا یەکەمین کارت ئەوە بێت لە جێگەیەکدا شوققە یان ژوور بگرە کە ژوور بە کەسانی دەرەوە و بێگانە نادەن. لە شوێنێك کە کەسانی دەرەوەی وولاّت لەوێ نیشتەجێ نین. لەم پەراوێز دروستکراوە بێ مێشکە پیسە دوور بە. ئامێز بۆ هەموو شتێك بکەرەوە و لەگەڵ شتیك تێکەڵ مەبە. مانەوە لە گۆشەگیریدا، نە قورسە و نە بەهادار. (کن مع الناس و لا تکن مع الناس)، لە راستیدا قسەیەکی پێغەمبەرانەیە.

(واقیعیەت، چاکی و جوانی) لەم دونیایەدا جگە لەم سێ شتە لە دونیادا هیچ شتێکی دیکە هی ئەوە نیە بۆی بگەڕێیت، یەکەمین لەگەڵ بیرکردنەوە، زانست. دووەمین لەگەڵ ئەخلاق، مەزهەب. سێیەمینیش لەگەڵ هونەر، عیشق، دەتوانێت تۆ لەم سیانە بێبەش بکات. هەستێکی هیچی رووکەشی هەرزەگۆیانی ووشك. شتێکی هاوشێوەی "جەواد فازیل"، یان "نیزام وەفا"، یان میهرەبانی تری

"لامارتینیا" و "دەشتی" و ترشی پیسی "بلیتس"! هەروەها دەتوانێت تۆ لەم زیندانی تەنگ و تەسکی ژیانکردنە، پەنجەرەیەك بۆ ئەم سێ دونیا گەورەیە والاّ بكات و رەنگیشە .... دەرگایەك و منیش یەكەمینم ئەزموون كرد و ئەمەیە كە ناوی خۆویستنم لێناوە، كە هەم هەروەك زانست و باشتر لە زانست ئاگایی ببەخشێت و هەمیش هەروەك ئەخلاق رۆح بەرەو چاكبوون دەبات و پەلكێش دەبات و چاكبوونیش و هەروەها جوانی و جوانییەكان (كە كەشف دەكات، دروست دەكات، چ رادیەك لەم دونیایەدا بەهەشتەكان و بەهەشتیەكان) شاردراونەتەوە. بەلاّم نیگاكان و دلّەكان هەموویان دۆزەخین، هەموویان بەرزەخین و نابینن و ناناسن، كوێرن، كەڕن، چ ئاواز گەلی مەلەكوتی كە لە سكوتی مەزنی ئەم زەمینەدا هەن و نابیستڕێن. هەموو هاوار و داد و غرغر و نق نق و قیل و قال و وتن و چرت و پرت و گفتوگۆ.

وای چەندە ئەم دونیایە خالّی و نەفرەتبار بۆ تێگەیشتن و دەستكردن، سەرمایەدارە، پڕە. چەندە مایە خوداییەكان لەم سەرزەمینی ئیبلیسەدا شاردراونەتەوە. ژیانكردن كاتێك مانای دەبێت كە هونەری دەرهێنان ئەم كانزا ناپەیدا و شاردراوانە فێر ببیت و تۆ دەزانی چەند ئەم قسەیە لەگەلّ وتەكانی "ژید" لەگەلّ "ناتانائیل"ی هاوشێوەن، لەگەلّیدا دژن! تەنها بەخششێك كە بۆ تۆ ئارەزوو دەكەم و دەخوازم لە ڕێڕەوی ئەم ڕێگەیەی كە ناوی تەمەنە، ڕێكەوت لەگەلّ یەك، دوو رۆحی سەرسوڕهێنەر، لەگەلّ یەك دوو دلّی گەورە، لەگەلّ یەك، دوو تێگەیشتنی مەزن و چاك و جوان.

بۆچی نالّێم زیاتر؟ زیاتر نیە! "یەكێك" زۆرترین ژمارەی مومكینە. دووم بۆ كێشانی گوتە هێنا و نیە گەرچی من بەشدارم لە پەرجووی رووداوی، ئەم گوتە

هاوسەنگە لە واقیعیەتی ناهاوسەنگ کە بۆ حەقیقەت هەمبوو. (بە هەردوو مانای ووشە)

بیابان بۆ بەرهەستکردنی ئەو رۆحەی کە بە میرات وەرمگرتوە و بە میرات پێی دەدەم بیخوێنەرەوە و ئەو دەستوخەتەی پشتی وێنەکەم کە لە وەڵامی هەواڵی لە دایکبوونت ناردم، بۆ تەنها و تەنها (ئامۆژگاری) یەك کە لە ژیانمدا تووشی بووم، بیپارێزە.

بەڵام تۆ "سەوسەن" سادە، میهربان، هەستی جوانیناس! رێکخراو و ورد، تۆش "سارا"ی رەندی قوڵ. سەرکەشی داهاتوو! بۆ ئێوە هیچ ئامۆژگاریەکم نیە. لە بەرامبەر ئەم رەشەبایەی لەسەر ئایندەی دروستکراوی ئێوەدا هەڵدەکات، ووشەکان، کە تەنها توانایەکن ئێستا لەبەردەستمدان، دەتوانن چ کارێك ئەنجام بدەن؟ ئەگەر بتوانیت لەم تۆفانەدا کرێك ئەنجام بدەیت، تەنها بەو هێزە سەرسوهێنەرەی کە لە قوڵایی رۆحتانەوە سەر دەردەهێنێت، گەرم ببێت و ببێتە ئیرادەیەك پڕ چەك بە ئاگایی و زاڵ و بەتوانا بەسەر هەموو شتێك و رەخنەگری هەرچی ئەوەی دەیهێننە پێشەوە و دوور خەرەوەی هەر پارووییەك کە دروستی دەکەن. چ سەخت و چ شکۆمەندە کە مرۆڤ خۆی چێشتلێنەری خۆراکەکانی خۆت بێت. خەڵکی هەمووی خۆرە و هەموویان ئەوە دەخۆن کە بۆیان دروست کردوون. بانگەشەی ئەمرۆ لەسەر ئەوەیە کە نان و پارووی کام چێشت لێنەر بخۆن. هیچ کەشێك لەبیری دروستکردنی پاروویەکدا نیە. ئەوەی دەیخۆن، ئەو خۆراکانەن کە ئەوانیتر هەرسیان کردووە. وە چەند هێڵنج هێنەر.

ئەویش چ کەسانێك دروستیان دەکەن؟ رێبەران و رۆشنبیرانی ئەمرۆی کۆمەڵگەکەمان. ئەوانەی کە مۆدێلی نوێی ژن بوون. "حەفدەی دیسەمبەری ئەمانە"، ئازادی ژنان! ئەمە تەنها سیفەتێکە کە ئەوانە سیفەت گەلی تایبەتی

ئەوانن، ئازاد لە ... پاکی گوتە رێگە نادات. ئەم خەیمە رەشانە، نە فەرهەنگ و شارتانیەتی نوێ و نە گەشەی فیکری و نە دۆزینەوەی کەسایەتی واقیعی و نە ئاشنایی لەگەڵ رۆح و روانین و شارستانیەتی ئەوروپا، بەڵکو مەقەستی لەسەری ئەمانەوە لابرد، ئەندامەکانی دڕاندن و پاشان ئەنجامی ئەمەش ئەوە بوو کە بوویە هەمان شا باجی خانمە کە بوو، دواجار لە جیاتی دانیشتن لە ماڵ و غەیبەتکردن، شەونشینی و گفتوگۆ دەکات. لە ماڵەوە بۆ شەقام گوازراوەتەوە.

بەڵام بابەتەکە هەر بەم سادەییانە نیە. "ژنی رۆژ" ئامارێکی بڵاوکردۆتەوە کە لە ساڵی (١٩٥٦) تاکو (١٩٦٦) واتە دەساڵ دامەزراوەکانی ئارایشت و و جوانکاری و بەکارهێنانی پێداویستیەکانی ئارایش و جوانکاری لە "تاارن"دا پێنج سەد جار زیادیکردوە و ئەمە تەنها چەماوەی بەرزبوونەوەی بەکارهێنان لە دونیادا و لە مێژووی ئابووریدایە. هەروەها تەنها مەبەست و ئامانجی کۆتایی هەموو ئەم نوێکردنەوەی یارییانە و خەباتکردن لەگەڵ خورافانەدا و ئازادبوونی نیوەیەك لە ئەندامانی کۆمەڵگە کە تاکو ئێستا شەل بووی، زیندانی بوو و لەم قسانە.... بەڵام جارێکی تر ئەمانە خاوەنی فەزیلەتێن، واتە ئیمتیازی چاودێرانی. چ گرفتارییبوونێکی سەیر لە بڕیاردانی نێوان ئەم دوو وەسفە هاورەگەزە دژەیەکەم پەیدا کردوە. هەر کاتێك ئەو "مەلا باجی خانمانە" دەبینم، دەڵێم جارێکی دی ئەوانیش هەرکات ئەو "جیکە جیکەی نەنە خانم"انە دەبینم دەڵێم دیسان ئەمانیش.

بەڵام تۆ هاوسەرەکەم، دەتوانم چیم بۆ تۆ هەبێت؟ تۆ کە بە لەدەستدانی من لە ژیاندا هیچ کەسێکت لە دەست نەداوە. نەك لە ژیاندا، لە ژیانکردن بە تایبەت بەو "جۆرەی" کە من دەناسیت و بەو سیفاتەی کە من بانگ دەکەیت. نەبوونی من بۆشایی و بەتاڵیەك لە نێوان هەبووەکانی تۆدا دروست ناکات و بەم حاڵەشەوە کە

وێنایەکی لەمجۆرەت لە رۆحی من لە زەینی خۆتدا وێنا کردوە، وەفای بەهێز و دۆستی پتەو و کەموکوڕی قبوڵنەکەر بۆ من، نیشانەی رۆحی پڕ لە راستگۆیی و پاکی و مرۆڤبوونی تۆیە، بە هەرحاڵ ئەگەر لە ناسینی سیفەت گەلی ئەخلاقی و تایبەتمەندی کەسایەتی مرۆیی من، هەڵەت کردبێت، لەم بنەمایەدا هەردووکیشمان باوەڕمان وایە کە: ئەگەر منیش مرۆڤێکی باش بوویم، هاوسەرێکی باش نەبووم و من بە هەرحاڵ، هێندە باشم کە ددان بە خراپیەکانی خۆمدا بنێم و هێندە توانا و دەسەلاتم هەیە کە لاوازییەکانم نەشارمەوە و لە شایستەبوونمدا هەر ئەوە بەسە کە خودای گەورە بە بەخشینی تۆ بە من، ئەوەی بە من نەداوە، قەرەبووی کردۆتەوە و ئەمەیە ئێستا هەستی ئامادەبوو بوونی نیە. بە بوونی تۆ دەزانم لە کاتێکدا هەروەك ئامادەبوویەك وەستێت دەکەم، نەبوونی من، هیچ کەمیەك لە ژیانی منداڵەکانمدا دروست ناکات و تەنها هەستێك کە هەمە هەمان ئەوەیە کە لە شیعری "توللی"یدا هاتوە کە ئەمەیە:

برۆ ئەی پیاو، برۆ وەکو سەگ بە ئاوارەیی بمرە
چونکە بوونت جگە نەفرەتی خودا نەبوو
سێبەری شومی تۆ جگە لە سێبەری ناتەواوی و نائومێدی
بەسەر هاوسەر و بێشکەی منداڵەوە نەبوو

لە رووی سامانەوە تەنها بیرخستنەوەیە کە بە حیسابی خۆم ئەوەی لە پارەکەم لە کاتی زەمین لەرزەدا خەرج کرد لە حیسابی ژمارە (٢)ی بانکی یارمەتی و دابەشکردن وەرگرتەوە و هەڵبەتە دڵم لەم کارە چڵکن بوو و مەبەستم بوو لە جەژنی ئەمساڵدا قەرزێك بکەم، یان شتێك بفرۆشم، بۆ پارەی ماڵەوە جارێکی تر بیگەڕێنمەوە و ئومێدەوارم تۆ ئەمکارە بکەیت.

ئارەزوویەکی ترم ئەوە بوو کە بەشێکی ئاو و زەوی لە "کاهە" بکڕم و بەناوی دایکەمەوە بێت و داهاتەکەی لە تەواوکردنی خوێندنی شاگردانی زیرەك و باشی خوێندنگەی ئەم دێیە کە "سەبزەوار" بەکاربهێنم و تاکو وەگرتنی دیبلۆم (مانگانە پەنجا تمەن بۆ هەر یەکێك و لە مانگەکانی خوێندندا کە نۆ مانگە، واتە ساڵی (٤٥٠) تمەن بۆ هەر کەسێك و لەبەرئەوە سێ کەس دەتوانن لەم رووەوە وانە بخوێنن، هەڵبەتە بە یارمەتی ئەمە و خێزانەکەی خۆیشی).

کاری سێیەمم بریتیە لەوەی کۆمەڵێك لە شاگردە ئاشناکانم، هەموو قسەکان و وانەکانی چوار ساڵی زانکۆ کۆبکەنەوە و ئامادەی بکەن و بڵاوی بکەنەوە کە باشترین قسەکانی من لە لابەلای هەر ئەم وانە وتراوانەوە و گفتوگۆ و وتن و بیستن و پەرش و بڵاوانەوە شاردراونەتەوە... هەروەها کۆنفراسەکانی زانکۆیی جیاجیام و نووسینە ئەدەبیەکانم وەکو شێوازی بیابان "کویر" بە جیا و نووسینە پەراگەندەکان فیکری و لێکۆڵینەوەکانم بە جیا و هەروەها ئەوەی لە ئەورووپا نووسیومە کۆبکرێنەوە و بپارێزرێن تاکو دواتر "انشاالله" چاپ بکرێن. هەروەها شیعرەکانم هەموویان بە ووردی کۆ بکرێنەوە و بسوتێنرێن کە هیچ نەمێنێتەوە مەگەر "قوی سپید" و "غریب رێگە" و "در کشور" و "شەمعی زینندان" و وانەکانی ئیسلامناسی لە "سقیفە بە بعد"، لەگەڵ "ئوممەت و ئیمامەت" لە ئیرشاد و ئەو کۆنفراسانەی پەیوەستن بە حەزرەتی "عەلی" و هۆکاری تەشیوعی ئێرانیەکان و دیالیکتیکی پەیدابوونی کۆمەڵ و گروپەکان لە ئیسلامدا و هەرچی دێتە ناو ئەم زەمینانەوە، وەك "بەیعەت" لە کانونی "ئەندازیاران" و (عەلی، حەقیقەتێك لەسەر شێوەی ئەفسانە) و ...هەموویان لە بەرگێکدا بەناوی بەرگی دووەمی "ئیسلامناسی" لە ژێر ناونیشانی "ئوممەت و ئیمامەت" ئامادە بکرێن.

ئەگەر وەرگێڕێکی شایستە پەیدا بوو، دەقی گفتوگۆی من لەگەڵ "گیوز" بۆ فارسی وەربگێڕێت لەبارەی ئەم بەرهەمەوە بەتایبەت کتێبی ( desalienation des societes musu lmanes) من و هەروەها وتاری دەرەکیم بەناوی (sociologie d' initiation) کە لەگەڵ چوار کۆمەڵناس لێکۆڵینەوەمان کردوە و "ئوت ز تود" چاپی کردوە. کتێبی (L' ange solitaire) دڵم نایەوێت وەری بگێڕن. کاری تێپەڕ و رابردووە.

هەموو پەیوەستیەکانت لە وتەی منەوە پێشکەشی ... خۆشەویستم بکە، کە ئەوەی لەبارەی منەو کۆی کردۆتەوە و دەربارەی نووسیوم لە چاپی منصرف ببێت، کە زۆر ئازارم دەبێت. داوای لێبوردن لەو دۆستانە دەکەم کە لەم ساڵانەی دواییدا بەهۆی گۆشەگیریمەوە و ئەمەش هۆکاری حاڵەتی رۆحی و فشاری تاقەت پروکێنی فیکری و دەماری بوو، کە لێم تۆراون و ئومێدوارم بزانن دووری لە ئەوانەوە نەبوو، بەڵکو راکردن لە منەوە بوو و ئەم دووشتەش یەك شت نین.

کتێبی بیابان"کویر" بە تەواوکردنی کۆتا وتار و زیادکردنی "داستانی بەدیهێنان" یان "دەردی بوون" (پاش پاکنووسی) تەواو بکەن و بڵاوی بکەنەوە. پێشەکیەکەی تەنها نووسینی "عین القضا"یە. هەروەها لە یەکەمین لاپەڕەیدا ئەم رستەیەی "تۆماس ۆلف": (نووسین بۆ فەرامۆشکردنە، نەك بەیادهێنانە).

لە کۆتاییی ئەم قسانەدا بە پێچەوانەی هەمیشەوە، هەست بە چێژ و رەزامەندی دەکەم کە تەمەنێکم بە چاکی گوزەراند. هیچ کات ستەمم نەکرد. هیچ کات خیانەتم نەکرد و ئەگەریش لەبەرخاتری ئەمە بوایە کە ئیمکانی نەبووایە، جارێکی تر ئەمە خۆشبەختیە. تەنها گوناهێك تووشم بوو بێت، جارێك بوو لە ژیانمدا کە بە اعوای ئامۆژگاریکەرانی گەورەتر و هونەری کلاوخستنەسەر، لە هەژدە ساڵیدا،

یەکەمین پارەیەك کە پاش حەوت، هەشت مانگ کارکردن جارێکیان مافیان پێدام و ئەو پارەیەی لە وتارنووسیندا کۆم کردبویەوە، (٥٠٠٠) تمەن بوو و لەبەرئەوەی خەرجیم نەبوو، وتیان بە مامەڵە و فرۆشتن بە ئێمەی بدە. منیش لەمانای ئەم کارە پیسە بێ ئاگا، ماڵی کەسێکم کڕی و بە پێنج هەزار تمەن و دامەوە بە کرێ بە خۆی مانگی بە سەد تمەن. تاکو پێنج، شەش مانگ، مانگی سەد تمەن قازانجی پارەکەم بەم ناونیشانە وەردەگرت و پاشان تێگەیشتم کە بە پێچەوانەی بیروباوەڕی زانایان و چاکسازانی دونیا، ئەمکارە کارێکی پیسە و بڕیم و پارەی سەرەتام تێکدا، بەڵام هێشتاش پەڵەی چڵکنی لەسەر زولاڵی دڵم بوونی هەیە و یاداوەرییەکانی بۆنی گەنیوی لە قوڵایی گیانمەوە بەرز دەکاتەوە و خۆزگە قیامەت بهاتایە و ئاگری ئەو شوعلانەی بسوتاندایەو پاکی بکردنایەتەوە. گوناهێکی دیکەم کە بە هۆی چاکە و پاداشتێکەوە تووش بووم، کە بریتی بوو لە مەرگی دۆستێك بوو کە رەنگە بمتوانیبا رێگریم لێی و کارێك بکەم، بەڵام ئەو کارەم ئەنجام نەدا، گەرچی نەمدەزانی کە چارەنووسێکی لەم جۆرەی دەبێت و نەمدەزانی دەبوو چیم بکردایە؟ لەم کارەدا هەست بە پیسی ناکەم، بەڵام دە ساڵی تەواو، دەسوتێم و هەموو رۆژێك خراپتر دەبێـ و سەختر. ئەگەر تاوانێکیش بووە ئاگری سزاکەیم بینیوە و رەنگە زیاتر لە تاوان و جگە لەمەش ئەگەر ئەنجامنەدانی خزمەتێك یان دەست نەبردن بۆ فیداکاری گوناه و تاوان نەبێت، ئیدی سۆراخی تاوانێك ناکەم و سوپاسی خودا دەکەم کە تەمەنم بە خوێندنەوە و نووسین و وتن تێپەڕاند کە باشترین "کار" لە ژیاندا، خەباتکردن بۆ ئازادی خەڵکی و رزگارکردنی نەتەوەکەمم دەزانی و ئەگەر ئەمە بەردەست نەبوو و نەتوانرا، باشترین کاری مرۆڤێکی چاك، مامۆستایەتی و نووسەری و من لە (١٨) ساڵیەوە کار و پیشەم ئەم دووانە بوون.

هەروەها خۆشەویسترین و گرانترین سامانێك کە دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت، خۆشەویست بوون و خۆشەویستیەکە کە زادەی ئیمانە و من تەنها ئەمەم دووریوە لەمەڕ کارم و شایستەییم سامانە و جگە لەمە هیچی دیکەم نیە و ئومێدەوارم منداڵەکانم ئەم میراتە بپارێزن و ئەم پارەیە بە قازانج بدەن و ریباکەی بخۆن کە حەلاڵترین پاروەو و حەماسەتم بریتیە لەوەی، کارم وتن و نووسین بوو و ووشەیەکم نەخستۆتە بەردەم بەرازەکان. رستەیەکم بۆ بەرژەوەندییەك حەرام نەکردووە و قەڵەمم هەمیشە لە نێوان "من" و "خەڵکی"دا لە کاردا بووە و جگە دڵم یان دەماغم کەسێك و شتێکی نەدەناسی و شانازیم بریتیە لەوەی لە بەرامبەر هەر پێشبینیەك و ئەو شتانەی بەردەمم، خۆبەگەورەزانینتر بووم و لە بەرامبەر هەر لاوازترێك لە خۆم، خۆبەکەمزان "متواضع" ترین.

کۆتا وەسیەتیشم بۆ وەچەی لاو کە وابەستەی ئەوەم و لەو نێوەندەشدا بە تایبەت رۆشنبیران و لەم نێوانەشدا بەتایبەت شاگردەکانم کە هیچ کات لاوانی رۆشنبیری وەکو ئەمڕۆ نایاندەتوانی بە سادەیی، پلە هەستیارەکان و سەرکەوتنە قورسەکان بە دەست بهێنن، بەلام ئەوەی لەم مامەڵەیەدا لە دەستی دەدەن، گەلێک گرانبەهاترە لەو شتەی کە بە دەستی دەهێنن. ئیدی ئەم قسەیەی هیچ گەرایەکی بێگانە کە لە مانەوەی مندا زۆر بە توندی بەشدار بووە کە بریتیە لەوەی کە (بەرێزی پیاو هەروەك شەرەفی ئافرەتە. ئەگەر جارێك لەکەدار بێت، ئیدی هیچ شتێك ناتوانێت قەرەبووی ناکاتەوە). هەروەها ئەوەی کە یەکەمین پەیامی ئێمە ئاشکراکردن و دۆزینەوەی مەزنترین نەزانراوی لێڵە کە لەو نەزانراوە کەمترین هەواڵمان نیە و ئەویش (دەقی کۆمەڵگە)یە و پێش ئەوەی بەرەو هە قوتابخانەیەك برۆین، دەبێت زمانێك بۆ قسەکردن لەگەڵ خەڵکیدا فێربین و ئێستا نیمانە. ئێمە لەسەرەتای پەیدابوونمانەوە زمانی ئەوەنمان بیرچۆتەوە و ئەم بێگانەبوونە،

گۆڕستانی هەموو ئارەزووەکانمان و پوچەڵکەرەوەی هەموو هەوڵ و کۆششەکانمانە.

کۆتا قسەشم بەوانەی بەناوی رۆشنبیری ، لایەنگری مەزهەبی منیان نەناسیوە و قاڵبی دەیانکوتا بریتیە لە:

دین چو من گزاف و اسان نبود

روشنتر از ایمان من ایمان نبود

در دهر چو من یکی و ان هم مومن

پس در همه دهر یك بی ایمانی نبود

واتە: (ئایینی وەکو من بوونی نەبوو، رۆشنتر لە ئیمانی من، ئیمان نەبوو، لە دەهرێکی وەکو من یەکێك و ئەویش ئیماندار، بۆیە لە هەموو کات"دهر"دا بێ ئیمانێك نەبوو).

ئیمان لە دڵی مندا، بریتیە لەو رۆیشتنە بەرەو سەرەوەیەی کە پاش گەیشتن بە سەربانی عەدالەتی ئابووری، بە مانای زانستی ووشە و ئازادی مرۆیی بە مانای نا بورژوازی زاراوە، لە ژیانی مرۆڤدا دەست پێدەکات.

سەرچاوە: سایتی فەرمی دکتۆر عەلی شەریعەتی.

# تایبەتمەندیەکانی

# کەسێتی پێغەمبەر (د.خ)

لە راستیدا بیرکردنەوە لە بارەی کەسێتی پێغەمبەرەوە (د.خ) گەلێك سەخت و دژوارە چ جای ناسین و کارکردن لەبارەیەوە، جا بۆ دەربازبوون لەو کارە لایەك و دلخۆش بوونمان لەوەی مرۆڤ بەهۆی سنوورداربوونی عەقلّیی یەوە کە ئەوەندە توانامان بەسەر مەسەلەکەدا دەشکێتەوە کارێك بکەین.

*خۆشویستنی پێغەمبەرو پایەداریی ئەو خۆشەویستنە

پێغەمبەر (د.خ) گەلێك تایبەمەندی جیاوازی هەبووە تایبەت بەکەسێتی مەزنی خۆی، من نامەوێت ئەوەی وتراوەو باسکراوە لێرەدا دووبارەی بکەمەوە.

بەدرێژایی ژیانی کارکردنم لەگەڵ پێغەمبەردا (د.خ) هیچ کەسایەتیکم بەرچاو نەکەوتووە کە خۆشویستنی و پایەداربوونی لە ترۆپکدا بووبن، لە هەمان کات و گرنگتر پێکەوە بەردەوام بوون بەدرێژایی مێژوو، دیارە ئەمەش خالێکی بەهێزی کەسێتی پێغەمبەرەوە (د.خ) کە گەلەکەی ئەوەندە خۆشیان ویستووەو خۆشیان دەوێت لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خۆشەویستییەش تا رۆژی دوایی پایەدار و بەردەوام دەبێت، لەلایەکی ترەوە ئەوەی گرنگ بێت خۆشەویستنی وەکو مرۆڤێك و وەکو پێغەمبەر بوونیش لە لایەك جیاوازبوون، بەدیوێکی تر وەکو تاکیش خۆشویستنراوە وەکو پێغەمبەریش ژیانی خۆشویستراوە، مێژوو و رابردووی ئەو

راستیەمان بۆ دەردەخەن پێویست ناکات لێرەدا ئاماژەی پێ بدەین تەنانەت لەلان غەیرە موسلمانەکانیشەوە دیارە ئەمەش تێکرای گەلەکەی دەگرێتەوە بەجۆرەها رەگەزو زمان و ناوچەو مێژووەوە.

* کەمەندەکێش بوونی بەرامبەر بە پێغەمبەر (د.خ)

یەکێکی تر لەو سیفەت و تایبەتمەندییانەی لە کەسێتی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت بەرامبەری کەمەندکێش بوونە بەجۆرێ ئەگەر پێغەمبەر (د.خ) چووبێتە هەر جێگایەك تەنانەت تێپەری کرد بێت بەهەر لایەکدا پاش خۆی هەرکەسێك چووبێتە ئەو جێگەیە ئەو کەس دڵی بۆی لێداوەو تووشی شۆکی کردوە ئیتر کەسەکە زانی بێت کە تەشریفی سەردانی ئەو شوێنەی کردوە یان بۆی باسکرا بێت وە یان نەیزانبێت، بەدیوێکی ئەم حاڵەتە دەروونییە خۆشەویستانە بووە دیارە ئەمەش موعجیزەیەکی مەزنە لەژیانی کەسێتی پێغەمبەر دا (د.خ) خواپێی داوە بەرامبەر بەگەلەکەی.

* بڵند نشینیی بوونی پێغەمبەر (د.خ)

خاڵێکی تر لەژیانی تاکە کەسی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت بلندنشینی ئەو کەسێتییە مەزنەیە لە ژیانی بەفەڕی دا ئەم راستیەمان بۆ روون دەبیتەوە تەنانەت پێش هاتنی وەحی بۆی پەنای بۆشوێنی بەرز بردووە ئەمەش لەرووی سایکۆلۆژییەوە نیشانەی ورە بەرزی و مەزنی و داننانە بەکەسێتی و بەرجەستە بوونی تایبەمەندی کەسێتیی، چونکە رەفتارو کاردانەوەی کەسێك چیرۆکی واقیعی زمانی ئەو کەسەیە ئەمەش لەکەسێتی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت بۆ

پەرستش پەنای بردۆتە بەر ئەشکەوتی (حیرا) لەکاتێکدا ئەو شاخی ئەشکەوتە لەتەواوی شاخەکانی دەوروبەری ئەو ناوچەیە بەرزترین و ناسراوترین بووە، یاخود چونی بۆ بەرزترین تەپۆلکەی ئەو ناوە  کە تەشریفی شەریفی چۆتەسەری لەکاتی حەجی مالئاوادا.

* شکاندنی نەریتە کۆنەکان و دروستکردنی نەریتێکی نوێ

یەکێکی تر لە تایبەمەندیەکانی کەسێتی ئەو کەسە مەزنە شکاندنین و وەلانانی داب و نەریتە کۆنەکانی رابردوو لەهەمان کاتدا دروستکردنی نەریت و بەهایەکی نوێ بوو بۆ مرۆڤایەتی، دیارە ئەمەش گەورەترین پێشرەویەتی یە لە ژیانی ئەو سەرداره دا کەجێی خۆیەتی مرۆڤایەتی لێرەشەوە بیکاتە سەرمەشق و شوێن پێی هەڵبگرێت و ئەو کارو رەفتارو هەلسوکەوتانە بەهەند بگرێت و کە پێغەمبەر لەسەری رۆشتوون و بەگرنگ و پیرۆزی زانیوون، وەکو یارمەتی دانی خەڵکی لەکاتی سەرقاڵی و ئەرکی خۆیداو و گوێ گرتنی لەسەرە رێ و بەدەمەوەچونی بۆکەسی لە خۆی بچوکتر  لە تەمەن و تەنانەت منداڵ و پیرەژن و هتد.. ئەمەش وانەیەکی پەندئامێزە زیاتر بۆگەورەو بەرپرسەکانە، تکایە شوێن کەوتەو خزمەتگوزارو بچوك و ژێر دەستەکانتان فەرامۆش نەکەن! بەڵکو بچن بەهانایانەوە نەك لە لەکاتی خۆی و لەجێی خۆی دا بەڵکو لەوکات و شوێنەی کە بەرامبەر نازانێت و ئەتەکێت و رۆشنبیریی نیە لەسەری تەنانەت خۆتان بکەنە قوربانی و لەکاتی گرنگی خۆتاندا بچن بەدەم خەڵکییەوە.

* پەروەردەی پێغەمبەر (د.خ)

پێغەمبەر (د.خ) سیفەتێکی مەزن و بەرجەستەی بووەلە ژیاندا بۆهەمووان بووەو وەکو یەکێکیش مامەڵەی لەگەڵ تێکڕای خەڵکیدا کردووە.

بەبروای من پێنج هۆکار دەبنە هۆی پەروەردەکردنی مرۆڤ ئەوانیش:

یەکەم: دایك.

دووەم: باوك.

سێیەم: قوتابخانەو کلتور.

چوارەم: شارستانیەت.

پێنجەم: رۆحی کات و سەردەم.

ئەوەی جێی سەرنجە پێغەمبەر (د.خ) بەدەر بووە لەم پێنج خاڵە. یەکەم دایك و باوکی لە تەمەنی منداڵی پێغەمبەردا (د.خ کۆچی دوایی دەکەن، دیارە لە بارەی قوتابخانەشەوە خوێندەوار بووەو نەچۆتە بەر خوێندن. کۆمەڵگەی عەرەبی ئەو سەردەمەش شێوە جەزیرە بووەو پێنجەمیش سەردەم لەدەست رۆم و ئێراندابووە.

بەرای من بێ بەش بوونی پێغەمبەر (د.خ ) لەم پێنج هۆی بۆ پەروەردە وای کردووە پێغەمبەر بگاتە ئەم پلەیە مەزنەیە لەلایەك ویستی خوایی لەسەر بووەو لەلایەکی تریش دەرچوونە لە یاساو پەروەردەی مرۆیی راستەوخۆ لەژێر پەروەردەو چاودێری خوادا بووە.

* بەهێزبوونی لەکاتی لاوازییدا

یەکێکی تر لە شتە سەرسورهێنەرەکانی ژیانی ئەو سالارە بەهێزی دەروون و پشت بەخۆبەستنی بووە لەکاتی لاوازیی دەسەڵاتدا، ئەوەتا لە مەکەوە وەدەنراوە و کۆچی کردوە بۆ مەدنیە و دەیەوێت بێت و سەردانی مەککە بکات و تەواف مالی خوا بکات هەرچەندە رێگایان نەدا بەڵام چاو نەترسی خۆی سەلماندو نامەی ناردنی بۆ پاشاو سەرۆکەکانی ئەو کاتە ئەویش بەناوهێنانی خوا و سەلماندنی پێغەمبەرێتی خۆی.

* پێغەمبەر لە ماڵەوەدا:

سیفەتێکی تری پێغەمبەرمان (د.خ) لەماڵەوە بۆ دەردەکەوێت ئەویش نەرم و نیانی و خاکی بوونی بوو لەماڵەوە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا، هەرگیز وکو پێغەمبەرو گەورەیەك لەماڵەوە هەڵسوکەوتی نەکردوە، بەڵکو وەکو هاوسەرو باوك هاوسەرێتی و باوکایەتی خۆی پاراستوەو ئاگای لەماف هەریەکەیان بووە کە چیرۆکی ژیانی خێزانی پڕ بووە لە بەخشندەیی و میهرەبانی.

* موحەممەد هاودەمی بێ نەوایان:

نموونە گەلێکی بەرجەستە لەژیانی پێغەمبەردا (د.خ) بەدی دەکرێت لەسەر هاودەمی و پشتیوانی هەژارو ستەملمێکراو تەنانەت بێسەرپەرستانیش، خۆ ئەگەر سیفەتێکی پێغەمبەرێتی خۆی جێبەجێ کردبێت ئەوا پێش بوونی بە پێغەمبەر ئەو سیفەتەی تێدا بووە.

* مەرگی پێغەمبەر

جوانتر لە هەموو تایبەتمەندیەکانی تری پێغەمبەر (د.خ) مەرگ بوو، مەرگی ئەو هەموو کەسانە ئاساییانە تا دەگاتە ئازیزانمان تا ئەندازەیەك جێی سەرنجە ئیتر بەتراژیدیا بێت یان ئاسان، بەڵام مەرگی پێغەمبەر (د.خ) زۆر حیکمەتی تێدابەدی دەکرێت بەو هەموو ئارامی و بێدەنگی و قوڵییەوە هێشتا پەیمان بە جوانی و پەندو وانەکانی نەبردووە.

سەرەتا ماوەی ساڵێك دەخایەنێت واتە لەحەجیماڵئاواییەوە تا کۆچی یەکجاری ئەویش بەنەخۆش کەوتنی، لەلایەکی ترەوە لەهەڵسوکەوتی دا هەستی پێ دەکرا بەرامبەر هاوسەرو یارانیدا، مردنیش هونەرە پێویستە مرۆڤ وەکو باقی هونەرەکانی فێری بێت و ئەنجامی بدات و تاقی بکاتەوە ئەو کەسەی دەزانێت چۆن دەمرێت بێگومان زانیویەتی چۆن بژیت، مەبەست لەمامەڵەیە لەگەڵ مردندا بەتایبەتی مردنی لەناکاو، کەسی مەزن دەزانیت دنیا بۆ ژیان نیە بەڵکو بۆ مردنیشە چونکە ئەویش کارو فرمانێکی مەزنە وەکو ژیان فەلسەفەو حیکمەت و هونەری خۆی تێدایە. لێرەدا پێغەمبەر (د.خ) باش لەم لەدۆخ و مەسەلەیە گەیشتبوو. ئەوسا حەجی ماڵئاوایی چەندین وانەمان لەبارەی مەرگی پێغەمبەرەوە (د.خ) نیشان دەدات وەکو چون بۆ مەککەو شەیداییوونی بۆ خاك و نیشتمانی و سەردانی کردنی کەعبەی پیرۆزو ماچ کردنی بەردە ڕەشەکەو دوو رەکات نوێژی سوننەت و پاشان هاتوچۆی نێوان سەفا و مەروە، لەهەموو گرنگتر ووتارە بەپێزەکەی بوو لە وتاری ماڵئاواییداو وەسیەتکردنی بۆپاش خۆی ئەوەش لای جەنابتان پەنهان نییە حەز ناکەم درێژەی پێ بدەم.

پاشان گەڕانەوەی لەگەڵ سوپایەك لە هاوەڵی بەرێزو بەرنوێژی کردن و وتاردانی و هەڵسوکەوتی لەنێو ماڵ و منداڵیدا و هەستی غەریبی تیکەڵ بە ئازارەکانی بوو بوو

تا ئیتر ئەوەی کە توانای نامێنێت و ئامۆژگاری موسلمانان دەکات بەدەستگرتنیان بەم ڕێبازەکەیەو لانەدانیان بۆ هیچ بەرنامەیەکی تر و هاوەڵ بڕیار نەدەن بۆ خوا پاش ئەوەی ڕێنموونی کردن.

ئەگەر حیکمەت و فەلسەفەو هونەری مان و نەمان و ژیان و مردنی پێغەمبەر(د.خ) تەنها دەستنیشان بکەین زیادەڕۆییمان کردووە، بەڵکو پێویستی بەزیاتر وتن و نوسین و لێکۆلینەوەی تیۆری و پراکتیکی هەیە.

تێبینی: ئەم بابەتە برای گەورە و ئازیزم "کاک حسێن ئەدهەم" وەریگێڕاوە.

------------

سەرچاوە:

دکتر علی شریعتی (۱۳۱۲– ۱۳۵٦) شمسی – ویژگیهای شخصیت پیامبر/ چاپ دووەم، ۱۳۷۸ چاپخانەی (پژمان) تهران.

## خۆشەویستی لەعیشق گەورەترە

عیشق هاودەمێکی کوێرەوپەیوەستە بە سەرێکی نابیناوە.بەڵام خۆشەویستی پەیوەندییەکی ئاگایانەیەو لەروی بیناییەوە رۆشن و زولاڵە.

عیشق زیاتر لە غەریزەوە ئاو دەخواتەوە و هەرشتێکیش لەغەریزەوە سەرچاوە بگرێت پوچ و بێ ئەرزشە.

خۆشەویستی لەرۆحەوە هەڵدێت و تا ئەو جێگایەی کەرۆح بەرز دەبێتەوە عروج دەکات خۆشەویستیش لەگەڵیدا بەرزدەبێتەوە.

عیشق لەنێو زۆربەی دڵەکاندا لەشێوەو رەنگی هاوشێوەی یەکتر دا دەردەکەوێتو خاوەنی سیفەت و حاڵەتی روکەش و لێکچووە.

بەڵام خۆشەویستی لەهەر رۆحێکدا جیلوەی تایبەتی خۆی هەیەولەرۆحەوە رەنگ وەردەگرێت لەبەرئەوەی رۆحەکان نەیاری غەریزەکانن.وهەریەکەیان رەنگ و تام و بۆنێکی تایبەتی خۆی هەیە. دەتوانین بڵێین بەئەندازەی هەر رۆحێک خۆشەویستی هەیە.

عیشق لەگەڵ ناسنامەدا بێ پەیوەندی نیەو لەگەڵ تێپەربوونی وەرزەکان و ساڵەکاندا کاریگەری بەجێدەهێڵێت.

بەڵام خۆشەویستی بە تێپەربوونی ساڵ و زەمەن تێکەڵاو و ئاوێتەی ژیان دەبێت و هێلانەی بەرزیعیشق لەگەڵ هەر رەنگ و رێژەیەکدا بەجوانییە بێ وێنەکەی

بەنهێنی یان ئاشکرا پەیوەندی هەیە هەروەك "شۆپنهاوەر" دەڵێت:"ئیتر بیست ساڵ تەمەنتان بدەن بەمەعشوق ئەوکاتە کاریگەری خۆی لەسەر هەستتان بخوێننەوە".

بەڵام خۆشەویستی ئەوەندە لەرۆحدا نغرۆ بووەو پەرێشانی جوانییەکانی رۆح بەجوانییەکی تری بێ وێنە دەبینێت.

عیشق تۆفانییەو وەك شەپۆلی دەریا وایە هەروەها سیفەتی "قەلەمون"ی هەیە، بەڵام خۆشەویستی ئارام و جێگیرە.

عیشق لەگەڵ نزیکی و دوریدا لە هەڵکشان و داکشاندایە.

ئەگەر دورکەوتنەوەیەکی درێژخایەن بێت ئەوا لاواز دەبێت.

ئەگەریش نزیك لەیەك و بەردەوام پەیوەندیان هەبوو،بێ ئەرزش و دەبێت و تەنها لەگەڵ ترس و هیواو دڵەراوکێدان.

بەڵام خۆشەویستی لەگەڵ ئەم حاڵەتانە نائاشنایەو دونیای ئەو دونیایەکی ترە.

عیشق هاودەمێکی یەك لایەنەیەبیر لەمەعشوق ناکاتەوە کە کێیە؟لەناوخۆیدا کەڵکەڵەی هەیە.

ولەم روەوە بەردەوام هەڵەدەکات و لەهەڵبژاردندا بەتوندی دەکەوێت، و

یان یەك لایەنە دەمێنێتەوەو هەندێکجاریش لەنێوان دوو بێگانەی لەیەك نەچوودا،عیشق پریشك دەوەشێنێت لەبەرئەوەی لە تاریکیدایەو یەکتر نابینن،دوای ئەم بروسکەو تەقینەوەیەکە لە تیشکی روناکی ئەو نێوچاوە دەتوانن یەکتر ببینن لێرەدایە هەندێك کات دوای پریشکی عیشق عاشق و مەعشوق

لەنێوچاوانی یەکتری دەروانن و هەست دەکەن کەیەکتری ناناسن و بێگانەیی و نائاشنایی لەدوای عیشقەوە لەبچوك بونەوەدا نیە، بەڵکو فراوانە.

بەلاَم خۆشەویستی لەروناکیدا رەگ دادەکوتێت و لەژێر نوردا سەوز دەبێت و گەشەدەکات.

هەرلەم لایەنەوەیەکە هەمیشە پێش ئاشنایی دیاردە دێت.لەراستیدا لەسەرەتادا دوو رۆح هێڵی ئاشنایيان لەسیماو نیگای یەکترەوە دەخوێننەوەو دوای"ئاشنابونیش"خودی خۆیان.

دوو رۆح، نەوەك دووکەس کەلەوانەیە دوو کەس لەگەڵ یەکتر لەهەمان روەوە ویست و ئیحساس بەخودی خۆیان بکەن. ئەم حاڵەتە بەئەندازەیەك جوان و هەڵهاتنە کە بەسادەیی لەژێر دەستی هەست و تێگەشتندا هەڵدێ و پاشان چێژی هاودەمی و بۆنی هاودەمی و گەرمای هاودەمی لەرەفتارو کردارو گفتوگۆی یەکتر هەست پێدەکەن وەلەم جێگشیەدا لەناکاو دوو هاوسەفەر بەچاودەبینن.کەبوون بە تەڵەی پەراگەندەیی و بێ پایانی میهرەبانی گەشتوون ئاسمانی ساماڵ و بێ لەکەو خۆشەویستی لەسەر سەریان خێمەی هەڵداوە.

عیشق دێوانەییەو دێوانەییش جگە لەپەرێشانی و سەرگەردانی "تێگەیشتن" و "بیرکردنەوە" شتێکی تر نیە.

بەلاَم خۆشەویستی لەعروجدایەو لەسنوری خۆی بەرزتر دەروات، تێگەیشتن و بیرکردنەوە لەزەویدایەو لەگەڵ خۆیدا عروجی پێدەکات.

عیشق جوانیە ویستراوەکانی لەمەعشوقدا دروست دەکات و خۆشویستن جوانیە ویستراوەکان لە"خۆشەویست"دا دەبینێت.

عیشـــق هەڵخەڵەتێنـــەرێکی گـــەورەو بـــەهێزەو خۆشویســـتن راســـتگۆییەکی راستەقینەوپاك بێ کۆتاو رەها.

عیشق خنکانە لەدەریاداو خۆشویستن ئازارو یان مەلەکردن.

عیشق بینایی دەگرێتەوە و خۆشویستن دەیدات.

عیشق تورەیەو توندولەهەمانکاتدا ناپایەدارو نادڵنیاو خۆشویسـتن نیـان و نـەرم و لەهەمانکاتدا پایەدارو سەرشار لەدڵنیایی.

عیشق هەمیشە لەگـەڵ گومانـدا ئالودەیـەو خۆشویسـتن سـەراپا یەقینـە و گومـان قەبوڵنەکەر.

لەعیشق هەرچەند بخۆینەوەتێرتردەبین، ولەخۆشویستن هەرچەند زیاتر تینوتر.

عیشق وزەیەکە کەلەعاشقدا ئەو بۆلای مەعشوق دەبات، و خۆشویستن راکێشانێکە لەدۆست، کە دۆست بـۆ دۆسـت دەبـات، عیشـق مـوڵکی مەعشـوقە و خۆشویسـتن جوانی شاراوە لەخۆشەویستدا.

عیشق، دەیەوێ مەعشوق پەنهان و ون بکات تا لەدەوری ئەودا بمێنێتەوە.

لەملاشەوە عیشق جیلوەیەك لەخۆویستی و رۆحی سـەوداگەری یـان جانەوەرانـەی مرۆڤیە، چونکە خۆی ئاگاداری خراپی خۆیەتی.

عیشـق و مەعشـوقی بەشـاراوەیی و گـوم نـاوی دەوێـت تـاوەکو لەسـنوری ئـەودا بمێنێتەوە لەبەرئەوەی کە عیشق جیلوەیەکە لەخۆویسـتی و رۆحـی سـەودا گـەری مرۆڤانەی تێدایە. چونکە ئاگادارە بەخراپەو بەدی خۆی و بەرامبەریشـی بەهـەمان شێوە دەبینێت و لێی بێزار دەبێت و لەدڵی دەگرێت.

بەلاَم خۆشەویستی خۆشەویستەکەی ئەزیز و خۆشەویست دەوێت و دەیەوێت هەموان ئەویان خۆشبوێت.

خۆشەویستی عیشقێکە مرۆڤ دورلە چاوی سروشتی خۆیەوە دروستی دەکات، خۆی بەوە دەگات و ئەوە هەڵدەبژێت. عیشق بەندەبونە و کەوتنە نێوان داوی غەریزەوە و خۆشویستن ئازادییە لە ناچاری سروشتیەوە. عیشق پاسەوانی جەستە و خۆشەویستی پێغەمبەری رۆح . عیشق بێئاگاکردنێکی کاریگەرو بەهێزە تاوەکو مرۆڤ بەژیانەوە سەرقاڵ بکات و بەسروشتی و سانایی بەو خۆشویستنەوە سەرگەرمی بکات ، خۆشویستن زادەی ترسە لە غوربەت و ترس و خۆئاگایی مرۆڤ لەم بێگانە بازارە زشتە بێهودەییەدا.

عیشق جارجار دەگۆردرێت تاوێك ساردە و تاوێك سوتانە، بەلاَم خۆشەویستی لەپەنای خۆشەویستەکەیدا دایە و نابزوێ، سارد نابێتەوە و گەرم نابێت و ناسوتێت و سوتێنەر نیە.

**تێبینی: ئەم بابەتە خوشکی شیرینم "فاتیمە ئەدهەم" وەری گێڕاوە.**

**سەرچاوە: کتێبی "معجزە محبت" د.سەید حسێنی، تهران، ١٣٧٣.**

# شیعر و پەخشان

# چەند کۆپلە شیعر و پەخشانێك

## بیابان

سەیرە ! کاتێك کە هەبوو نەمدەبینی،

کاتێك دەخوێنێت، نەم دەبیست...

کاتێك بینیم کە نەبوو...

کاتێك بیستم نەیخوێند... !

چ غەمنەنگێزە کاتێك سەرچاوەیەکی سارد و زولاڵ،

لە بەرامبەرتدا، دەجوشێت و دەخوێنێت و دەناڵێنێت،

تینووی ئاگر بیت و نەك ئاو...

وە سەرچاوە کە ووشك بوو،

سەرچاوە لەو ئاگرەی کە تۆ تینووی بووی، بوویە هەڵم

و بە هەوادا چوو،

ئاگریش بیابانی رۆشن کردەوە

و خستیە ناو خۆیەوە

و لە زەوی ئاگر روا

و لە ئاسمان باری

تۆ تینووی ئاو بوویت، نەك تینووی ئاگر،

وە پاش تەمەنێك توانەوە

لە غەمی نەبوونی کەسێکدا کە،

تاکو هەبوو،

لە غەمی نەبوونی تۆدا دەتوامەوە

وە تۆ فێربوویت کە ئەوەی دوو رۆحی نزیك،

لە غوربەتی ئەم ئاسمان و زەمینە بێ دەردە،

دەردەمەند و ئازاراوی دەکات و نیازمەندی

بێقەراری یەکتر دروست دەکەن،

خۆشویستنە.

وە من لە نیگای تۆدا،

ئەی نزیکی مەزنی من،

ئەی ئەو کەسەی لە روخسارتدا ترسی غوربەت پەیدا بوو

وە لە شۆکەی پڕ لە درۆدۆنگی قسەت،

شەوق و تاسەی راکردن دەرکەوتوو

بینیم کە تۆ دوورخەرەوەی ئەم زەمینەی!

ئێستاش تۆ بە مەرگ رۆیشتویت و من لێرەدا

تەنها بەو ئومێدەی قسە دەکەم

کە بە هەر هەناسەیەك هەنگاوێك لە تۆ نزیکتر دەبمەوە

ئەمەش ژیانی منە.

# دایک

دایکە نیگای ماندوو و تاریکت

لەگەڵ من هەزار جۆر قسەی هەیە

بە سەد زمان بە گوێی دڵم دەڵێت

ئەو ئازارەی یاداوەریت لە منی هەیە

*    *    *

دەردێك لە غوباری لێڵیەکان

هەورێك لەسەر رووی مانگت دەبینم

دەسوتێنێت وەکو تیشك، خەرمانەی گیانم

ئەو سوتانەی لە نیگاتدا دەیبینم

*    *    *

چاوێك كە پڕ لە خەندەی شادی بوو

تاریك و ئازاراوی و غەمباراوی

جگە لە سێبەری بێتاقەتی لە چاوتدا هیچ نیە

ئەو شوعلەی نیگایە، پڕ لە دوکەڵە

* * *

ئارام پێدەكەنی و دەزانم

لە سینەتدا، كێشمەكێشی تۆفان

پێكەنینی ئازاراویت ئەی دایە

سوتێنەرترە لە فرمێسكی هەتیوان

* * *

تاڵە ئەم قسەیەی لەسەر لێوەكانمە

دایە بەلای گیانی تۆ من بووم

بەڵام تۆ داخەكەم، وا گومانت برد

منداڵی میهرەبانی تۆ من بووم

* * *

وەكو شوعلەیەك كە مۆمی لەسەرە

هەردەم لە جەستە و گیانی تۆم كەمكردەوە

كە بتی تۆم شكاند و شەرمم هات

لەگەڵ ئەوەی وەکو خودا دەتپەرستم

*   *   *

شەرمەزارم من، دەکەومە سەر پێیەکانت

چونکە لەسەر دڵم رەگی تاوانبارییە

دایکە بەلاّی گیانی تۆ من بووم

ئەم دانپێدانانە تاڵە تاوانبارییە

## دونیـــــای مـن

وەی چەند سەخت و دوور و درێژ تێپەڕ بەسەر "ودای حیرەت!"

مەرگێك تەمەنێك درێژەی کێشا!

غوربەت نیشتمانم بوو و خۆر باوکم، بیابان ئاگرگرتوو، دایکم

بەسەری پەنجەکانی نەوازش گەر باران ئەشکم روام

وە بە گریانی هەورە خەمبارەکان، تێریم نۆشی

وە لە خاکی پڕ بەرەکەت و بەرهەمداری ئازاردا، رەگم داکوتا

بە رەنج و ئازار پەروەردەم کرد و لە چاوەڕوانی، بالاّم کرد.

تەنیایی بوویەماڵی دڵم و گۆشەگیری شوێنی پشووی.

وە نائومێدی لانکەی و ئارەزووی بێ ئومێد، پیری چیرۆك بێژەری

وە شیعر، شیر مەمکەکانی و دایکی بێکەسی، باوەشی ئارام بەخشی.

وە تینوویەتی، ئاوی شیرین و ئەفسانە، شیرینی تامی.

وە خەیاڵ، حیکایەتکەری مەعشوقی و ئەفسانە، مێژووی.

وە چیرۆك، یاداوەر دروستکەری ئایندەی و ووشەکان، ئەوزشکەرانی چاك و میهرەبانی.

وە قەڵەم، جوبرەئیلی پەیامهێنەری و دەفتەر، شوێنی بەیەکگەیشتن مەحرەمی.

وە شەو، پڕ درەختی دارخورما، خەڵوەتی ناڵینی

وە خۆشویستن، مامۆستای

وە ئیمان، قوتابخانەی و قوربانی، تاقیکردنەوەی.

وە غوربەت، نیشتمانی و نائومێدی و ئومێدی

وە جیایی، سرودی هەر سەحەرێکی

وە راکردن، وورتە ورتی هەر رۆژێکی و ویرددی هەر نیوە شەوێکی

وە رەهایی "رزگاری " مەزهەبی

وە بەرد و مانگ، شوێنی چاوپێکەوتنی

وە بەهەشت "اوپا"، سەری مەنزڵی ئارەزووی.

## بسوتێم...

چە ئومێدێك ببەستم لەم ژیانەدا

کە لە نائومێدیدا نەما جوانی

نەما جوانی و بۆمان نەهات

پەیامی وەفایی لەم ژیانەدا

*   *   *

بناڵم لە میحنەت هەموو ڕۆژێك تاکو ئێوارە

بگریم لە حەسرەت هەموو ئێوارەیەك تاکو ڕۆژ

تۆ دەڵێی ئیسفنجم لەسەر ئەم ئاگری "طور"ە

بسوتێم لەم ئاگری ئارەزوو و سوتانە

*   *   *

لەناو کۆمەڵی نائاشنایاندا

پەیامێکی پێگەیاندم ئاشنایی؟

بیستم قسەگەلێك لە میهر و وەفا

بەڵام نەمبینی نیشانێك لە میهر و وەفایی

*   *   *

چونکە کەس بە زمانی دڵم ئاشنا نیە

چەند باشتر کە لە شکۆ، بێدەنگ بم

چونکە یاری من نیە هاودەرد،

باشترة لة يادى ياران، فةراموش بم

# تەوتەم

**هەرکەسێك تەوتەمێکی هەیە!**

کە عیشقی بۆی هەیە، خۆشی دەوێت، دەناڵێت، نزا دەکات، دەگری، فرمێسك دەرێژێت، چاوەڕوانی دەکات، ئارام دەگرێت، دڵسۆزی دەنوێنێت، بەهای پێدەدات، ئازاری لێ دەبات، خۆبەخت دەکات، دەتوێتەوە.

ئەو لەو جوانیانەی کە سروشت نیەتی، ئەو چاکانەی لۆژیك لێیان تێناگات، پیرۆزییەك لە رەگەزی ئەم دونیایە نیە، ئیلهام وەردەگرێت، فێر دەبێت، لە گەردەکانی خۆیدا دەیتوێنێتەوە و بە ویژدانی پێویست و تینووی دەکات، ئیمانی پێی هەیە، نوێژی بۆ دەکات، خۆبەگەورە زانینی پۆلاینی (کە سەری بۆ هیچ توانا و دەسەڵاتێك دانەنەواندوە) بە غرورەوە بەسەر باڵای واڵایدا دەشکێتەوە و ئیسماعیل نان، مەقام و پلە، گیان و تەنانەت ناوی خۆی، لە میحراب یادەوەری ئەودا، بە تیغی بێ ئۆقرەیی، قوربانی دەکات.

وە پاش تەوافی "یەکتایی"، نوێژ "یەکتایی"، کۆششی "بێ تۆیی"، پاشان، کۆچ بەرەو ئەو، بە تێپەڕبوون لە "شەوق و تاسەی ناسین"، "هەستی تێگەیشتنی"،

گەیشتوو تاکو کۆتایی مەنزڵی حەجی، لە "مونا"ی عیشقیدا، "جەژنی خوێن"ی خۆی دەکات و لە پێیەکانیدا تاکو سەربانی بەرزی "شەهادەت" بەرز دەبێتەوە و، بە میعراجی مەرگی سوور دەڕوات و لە "سدرە المنتهی"ی "خۆبەخشی خۆی" تێدەپەڕێت و بۆ ژیانێکی تر لە خوێنی خۆیدا نوقم دەبێت و لە چاڵی شوێنی کوشتنی خۆیدا سەر نەوی دەکات و لەسەر دوو باڵی، دوو شاپەڕی شەوق و تاسە، لە دڵسۆزی و خۆبەخشین دەڕوێن و بەرەو لای خودا لە شەقەی باڵ دەدات!

هەر کەسێك تەوتەمێکی هەبە و تەوتەمی هەر کەسێك نزیکی ئەوەی بەهەشتی منە، بە جێماوی ئەو منەی کە لە "ژیان"دا بە "شەهادەت" گەیشتوە، لە هەیاهوی قەلەرەشانی پیس و چاوچنۆکی "رۆژانە"، خامۆش بووە و لە نومایشی دڵ تێکهەڵهاتنی زەوی و ئاگر یاری خەڵەتێنەری سەردەم، فەرامۆشکراوە.

بە هەرحاڵ، هەر کەسێك تەوتەمێکی هەیە و تەوتەمی من "قەڵەم"ە

هەر کەسێك تەوتەمێکی هەیە و تەوتەمی هەرکەس یاداوەریەتی کە رۆژێکیش ئەویش مرۆڤێك بووە و نیشانەی ئەوەی کە هێشتا دەتوانێت پرسیار بکات، دەتوانێت خۆی بۆ یەکێکی تر بێت، دەتوانێت عیشقی هەبێت، لە سوود و چاکسازی و واقیعیەت سەرووتر رۆیشتوە و دەتوانێت لە مانای بەها، حەقیقەت و ئامانج تێبگات، تەنانەت دەتوانێت تاکو "خۆبەخشی" بڕوات.

هەر هۆزێك تەوتەمێك دەپەرستێت کە رۆحی باپیرەی یەکەمینی هەموو تاکەکانی هۆزەکەی تێدا تواوەتەوە، لە ئەو زیندووی نەمرە، رۆحی قەبیلە لە ئەودا جەستەی بۆ دروستبووە، کوشتنی ئەو، خواردنی، لەسەر ئەندامانی هۆزەکەی حەرامە، بۆ هۆزەکانی تر حەرام نیە، ئەوان بێگانەن، ئەوان تەوتەمێکی تریان هەیە، لە خوێ، و خاك و نەژاد و رەچەڵەکی تەوتەمێکی ترن، فرۆشتن و گۆڕینەوە و رستنی خوری و دۆشینی شیر و لێکردنەوەی پێست و کوشتن و خواردنی هەر

تەوتەمێك لەسەر هۆزەکەی حەرامە، تەوتەم خودای هۆزە، "رب النوع" هۆز، ناموسی هۆز، بەرجەستەبوونی رۆح و شەرەف و پیرۆزی و حەقیقەت و کەسایەتی و دەرکەوتنی خود و نەژاد و رەچەڵەك و یەکتایی و رەسەنێتی و کرۆکی مرۆیی هاوبەش و چیەتی ئەودیوسروشتی هاوبەشی هەموو هۆزە.

قەڵەم نزیکی راستەقینەی منە، بەخششی "روح القدس" منە، زمانی دەفتەرە خۆڵەمێشی وسەوزەکانی منە، هاوزێدی بەدیهێنانی منە، زێدی کۆچی منە، هاوڕای نیشتنەوەی من و نزیکی غوربەتی و هاوەڵی دووخراوەی من و گوێگری جۆری چوارەمی من و هاودەمی خەڵوەت تەنیایی و سەربەرزی من و یادهێنەرەوەی سەرگوزەشتە و یاداوەری سروشت و جارێکی تر چارەنووسی من دەڵێتەوە، رۆحی منە کە جەستەی دۆزیوەتەوە، "مرۆڤبوون"ی منە کە بۆتە شت.

وە قەڵەم تەوتەمی هۆزی منە. خودای هەموو هۆزەکان، خودای هەموو جیهانیان سوێند بەو دەخۆن، بە هەرچی لەوەی دەچکێت، سوێند دەخوات، بەو خوێنە رەشەی لە گەروویەوە دەچکێت، سوێند دەخوات.

وە من؟

ئەو "ئەمانەت"ەیە کە خراوەتە سەرشانم!

ئای کە چەند سەخت و قورسە! زەوی لە کێشانی باری قورسدا دەشکێت، کێوەکان ئەژنۆیان دەشکێت و ئاسمان درز دەبات و دێتە خوارەوە.

تەوتەم قەبیلەی منە، رۆح "ئێمە" تیایدا بۆتەوەیەك، "ئێمە" تیایدا تێکەڵ بووین، لەگەڵ یەکدا دەژین و بەیەك دەگەین، لەگەڵ ژیانیشدا — کە هەوڵدەدات — وە کات — کە جیایی دروست دەکات — خود پەرستی — کە بێگانەبوونی

دەهێنێت – وە ترس – کە هەموو کەسێك دەترسێنێت – وە عەقڵ – کە بەش و رشتەکان دەپچڕێنێت – وە تەنهایان دەکاتەوە...

قەڵەم تەوتەمی منە، ئەو ناهێڵێت کە فەرامۆش بکەم، کە فەرامۆش ببم، کە خوو بە شەوە بگرم، کە باس لە خۆر نەکەم، کە دوێنێ لە بیر بەرمەوە، کە سبەینێ نەهێنمەوە یاد و بیری خۆم کە لە "چاوەڕوانی" چاوپۆشی، کە خۆبەدەستەوە بدەم، نائومێد ببم، روو لە خۆشبەختی بکەم، خوو بە خۆبەدەستەوەدانەوە بگرم، کە !...

قەڵەم تەوتەمی منە، ئەو لە نێو قیل و قالەکانی ژیانی رۆژانە، هەیاهوی بێهودەیی، کێشمەکێشەکانی پوچی، پیسیەکانی ژیان، نزمی و پەستیەکانی زەوی، نامیهرەبانیەکانی سەردەم، توندوتیژی خاك و هیچی بوون... شەو و رۆژ، لە دەستمدا، لەسەررووی سینەم، پڕ شەوق و تاسە و بێ ئامانن ئەم ووشە خودایانە لە خوێنمدا، لە دڵمدا، لە رۆحمدا، یادم، خەیاڵم، یاداوەریم، ویژدانم و خوو و نەریتم دەڕژێت کە:

خودا شێوەیی، بەهەشت، ئادەم، تەنیایی، حەوا، شەیتان، عیشق، سەرکەشی، بینایی، نیشتنەوە، بیابان، غوربەت، رەنج، "ئەمانەت"، پەیام، چاوەڕوانی، ئونس و نزیکی، بەند و کۆت، جەبر، خودئاگایی، هەستان، شیعەگەری، خەلافەت، ویلایەت، ئیمان، بەرژوەندی، حەقیقەت، سوننەت، ئایەت، توقیە، تەقلید، جیهاد، ئیجتهاد، شەهادەت، خۆبەخشی، خەڵك، تینوویەتی، تەواف، کۆچ، غەیبەت، ئیحرام، حەج، عەرەفات، مەشعەر، مونا، سەربڕین، پەرستگا...

قەڵەم تەوتەمی منە، تەوتەمی ئێمەیە، سوێن بە قەڵەم، بەو خوێنە رەشەی لە گەرووییەوە دەچکێت، سوێند بەو پاڵفتە خوێنەی لە زمانیەوە دێتە دەرەوە، سوێند بەو هەراو زەنای ئەو ئازار و دەردەی لە سینەیەوە دێتە دەرەوە... کە

تەوتەمی پیرۆزم نافرۆشم، ناکوژم، گۆشت و خوێنی ناخۆم، خۆنادەم بەدەست زۆر و دەسەلاتیەوە، پارە نابەخشمە گیرفانی، بە پەنجەکانم تەزویری بۆ ناکەم، دەستم دەکەمە قەڵەم و قەڵەمم لە دەستم بەرنادەم، چاوەکانم کوێر دەکەم، گوێکانم کەڕ دەکەم، پێیەکانم دەشکێنم، پەنجەکانم برگە برگە دەبڕم، سینگەم دەگەڕێم و دەپشکنم، تەنانەت زمانم دەبڕم و لێوم دەدورمەوە...

بەلاّم قەڵەمم بە بێگانە نادەم.

سوێند بە گیانی ئەو، کە گیانم دەکەمە فیدای، ئیسماعیلم دەکەمە قوربانی بۆ ئەو، سوێند بە خوێنی رەشی ئەو کە لە "غەدیر"دا لە خوێنی سوورمدا نوقمم، بە فەرمانی ئەو، بۆ هەر جێگەیەك پێم بلێت، بۆ هەر جێگەیەك بلێت بڕۆم، هەرچی لەمن بخوازێ، لە گوێڕایەڵیدا ناوەستم و بەپەلە گوێڕایەڵی ئەبم.

قەڵەم تەوتەمی منە، ئەمانەتی "روح القدس"ی منە، خەلاّتی مەریەمی پاکی منە، صەلیبی پیرۆزی منە، لە وەفای ئەودا، نابمە ئەسیری قەیسەر، نابمە کڕیاری پارەی یەهود، خۆ بەدەست "فریسیان" نادەم، بهێڵە بەسەر قەد و بالاّی بەرز و راستەقینە و بەهێزی قەڵەمم، لە خاچم بدەن، بە چوار مێخەك بمکوتن، تاکو ئەو کوڵەکەی ژیانم بووە، خاچی ببێتە مەرگم، شایەدی پەیامم بێت، گەواهیدەری شەهادەتم بێت، تاکو خودا ببینێت کە بەناو نەچومەتە سەر قەڵەم، تاکو خەڵك بزانێت کە بۆ تامی دڵم و گەڕان بەدوای چێژدا لەسەر سفرەی گۆشتی حەرامی تەوتەمم دانەنیشتووم، تاکو زۆر بزانێت، پارە بزانێت و تەزویر بزانێت کە ئەمانەتی خودا، فەرعەنەکان ناتوانن لێم وەربگرنەوە، قارونیەکان ناتوانن خەلاّتی عیشقم لێ بکڕن و بەلعەمیەکان ناتوانن یادگاری پەیامم لێ وەربگرنەوە...

...هەرکەسێك، هەر هۆزێك تەوتەمێکیان هەیە، تەوتەمی من، تەوتەمی هۆزی من، قەڵەمە.

قەڵەم زمانی خودایە، قەڵەم ئەمانەتی "ئادەم"ە، قەڵەم خەڵاتی عیشقە، هەر کەسێك تەوتەمێکی هەیە،

وە قەڵەم تەوتەمی من.

وە قەڵەم تەوتەمی ئێمەیە.

سەرچاوە:

سایتی فەرمی دکتۆر عەلی شەریعەتی.

## ناساندنی بەرهەمەکانی

## "د.عەلی شەریعەتی"

بەرهەمـەکانی "دکتـۆر عـەلی شـەریعەتی" لـە (٣٦) بەرگـدا کۆکراونەتـەوە، کـە هەندێکیان دوو بەرگن، هەرچەندە ئێستا لە ئێران و تەنانەت بـە زمانـەکانی تـریش گوڵبـژێر یـان بەشـێکی چـەند بەرهـەمێکی دەکەنـە کتێبێـک و نـاوێکی دیکـەی لێ دەنێن، بەڵام دەشێ بڵێین ئەو دەزگایەی کە بەناوی "خۆیەوەیەتی" کۆی هـەموو بەرهەمـەکانی لـەم (٣٦)بەرگـەدا کـۆ کردۆتـەوە، پێمـان باشـبوو نـاوەڕۆکی ئـەو کتێبانە لێرەدا بخەینە بەردەستی خوێنەران:

## کۆبەرهەمی ژمارە( ١ ) لەگەڵ گوێگرانی ئاشنا

لەگەڵ باوک، مامۆستا و موراد- هاوسەر و منداڵ

لەگەڵ هاوڕێیان، برایان و خوشکان

لەگەڵ ئێوە دووکەسی شەهیدی شاهێد و لەگەڵ ئێوەش دووکەس

دوو وەسییەت

کۆتا نووسینەکان

کۆتا قسە لەگەڵ تۆ ئەی میهرەبانی جاویدانی زیان قەبوڵ نەکەر

وێنەی هەندێ لە نامەکان


## کۆبەرهەمی ژمارە( ٢ )، خودسازی شۆرشگێڕانە


چۆن مانەوە

عیرفان- بەرامبەری- ئازادی

عیشق- یەکتاپەرستی

ئازادی-پیرۆزی ئازادی

راپەرینی خودسازی

کوتان لەدەرگای ئەڵقەی بوون

سڵاوەکانی نوێژ

ئازادی

شەوی قەدر

شەوڕەوی

## کۆبەرهەمی ژمارە ( ٣ ) ئەبوزەر

دەفتەری یەکەم ئەبوزەری غەفاری

دەفتەری دووەم جارێکی تر ئەبوزەر"نوسراو"

جارێکی تر ئەبوزەر"ناساندنی شانۆنامە"

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٤ ) گەڕانەوە

گەڕانەوە

گەڕانەوە بۆ خود

کاتێ سیفەتەکان دیارن

موعجیزەی ئیمان و ئاگایی

بۆ کامە خود بگەڕێینەوە؟

گەڕانەوە بۆ کام خود؟

چارەنوسی ئەندێشەکان

چاکسازانی نوێگەر

چەپگەرایانی راپەرینی سیاسی

کۆمەڵگەو مێژوو

ئێمە لەکوێی مێژووەین؟

فەلسەفەو زانستی مێژوو

مارکسیزم و چارەنوسی مێژوو

ئەرکی رۆشنبیران

جەبری مێژوو

پەیامی رۆشنبیر

ئاسیمیلە

پچرانی مێژوویی

ویژدانی مێژویی

هەستی رابردوو و ناسینی خودی مێژووی لە رۆژهەڵات

یاری نوێگەری

داگیرکاری وئاسیمیلاسیون

خزمەت و چاکسازی

رۆشنبیرورۆشنبیران

داگیرکاری ئەفریقا

لاوازی روانینی رۆژئاوایی مارکسیستی لە شیکاری داگیرکار

مارکسیزم و شیکاری ژێرخان

ناسیۆنالیزم و مارکسیزم

وتەیەك لەبارەی مەزهەب

کۆمەڵناسی و پەیمان

تەکنیکی رۆشنبیربوون

سێ بنەما

پەیوەندی زانست و کار

چەنین ساڵ بریار– ئەبێ چی بکەین؟

روانینی رەخنەگرانەی رۆشنبیر

زانستگەڕایی

جوگرافیای ووشە

ئەرکی رۆشنبیر لەکۆمەڵگەی ئێستەی ئێمەدا

کورتەی باس

ئێمە خاوەنی چەندخودگەڕایی مێژووی.فەرهەنگین.

رۆشنبیر،بیرمەندی بەئاگا،خاوەن ئایدۆلۆژی.

ماددەگەرایی

مارکس، نەتەوەگەرایی، ماددەگەرایی.

دنیابینی من پشتبەستوو بەتەفسیری مەعنەوی دنیا

وەسێتنامەی فانون

## کۆڕبەرهەمی ژمارە( ٥ )، ئێمە و ئیقباڵ

ئیقباڵ، چاکسازی سەدەی کۆتایی

ئێمە و ئیقباڵ

## کۆبەرهەمی ژمارە( ٦ )، شیکردنەوەیەك بۆ مەراسیمی حەج

پێستی هەڵگەڕاوە

بیست و سێ ساڵ له بیست و سێ ڕۆژ

مەراسیم

حەج

حەجی گەورەتر

گەورەتر لەحەج: شایەتیدان

## کۆبەرهەمی ژمارە( ٧ ) شیعە

شیعە حیزبێکی تەواو

یادهێنەرانی مێژووی شیعەگەری..

بەرپرسیاریەتی شیعەبوون.

## کۆبەرهەمی ژمارە ( ٨ ) نزا

نزا له "ئەلیکسس کارل"

قوتابخانەی "سەجاد"

نزا"دەق"

جوانترین ڕۆحی پەرستشکەر

## کۆبەرهەمی ژمارە٩-شیعەگەری عەلەوی و شیعەگەری سەفەوی

شیعەگەری سورو شیعەگەری رەش

شیعەگەری عەلەوی و شیعەگەری سەفەوی.

## کۆبەرهەمی ژمارە( ١٠ ) لایەنگیری چینەکانی ئیسلام

کۆمەڵێکی تەواوی بابەتی جۆراوجۆرە وەکو سنووری ئیسلامی راستەقینە و سوودی چینە فەرمانڕەواکان.

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ١١ ) مێژووی شارستانییەت، بەرگی( ١ )

شارستانییەت چییە؟

باسێکی گشتی سەبارەت بە شارستانییەت و کلتور

ناساندنی مێژوو

قوتابخانە مێژووییەکان و شێوازی لێکۆڵینەوەکانیان

بۆچی ئەفسانە؟ڕۆحی هەموو شارستانییەتەکانی دونیایە

مێژووی شارستانییەتی چین

روانینی زەرد"روانینی چینی"

## کۆ بەرهەمی ژمارە( ١٢ ) مێژووی شارستانیەت، بەرگی( ٢ )

ڕووداوی سەرسوڕهێنەری مێژوو

تایبەتمەندییەکانی سەدەکانی هاوچەرخ

باسێکی گشتی سەبارەت بە دنیابینی و کلتور

دنیابینی و ژینگە

لایەنگری سیاسی لە سەدەکانی ناوەڕاست

بابەتی خۆ دۆزینەوە

تایبەتمەندی شارستانی ئەمڕۆ

## کۆبەرهەمی ژمارە( ١٣ )، "نیشتنەوە" لە "بیابان"دا

نیشتنەوە

بیابان

ڕونکردنەوەیەك دەربارەی سرودی بەدیهێنان

تەوتەم پەرستی

دۆستانی ئازیزم

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ١٤ ) مێژوو و ناسینی ئایینەکان، بەرگی ( ١ ).

وانەکانی یەکەم تا حەوتەم

کۆمەڵێکی گشتی توێژینەوە مێژوو و بنەمای فەلسەفی ئایینە سەرەتاییەکان،ئاینەکانی چین،هیندی،زەردەشت و...هتد ئەوانی تر دەبێت.

## کۆبەرهەمی ژمارە ( ١٥ ) مێژوو و ناسینی ئایینەکان، بەرگی( ٢ )

وانەکانی هەشتەم تا چواردەهەم

کۆمەڵەی بەرگی دووەمی مێژوو ناسینی ئایینەکانە.

## کۆبەرهەمی ژمارە ( ١٦ ) ئیسلام ناسی، بەرگی( ١ )

## کۆبەرهەمی ژمارە ( ١٧ ) ئیسلام ناسی، بەرگی( ٢ )

## کۆبەرهەمی ژمارە ( ١٨ )، ئیسلامناسی، بەرگی( ٣ )

وانەکانی یەکەم تا بیست و حەوتەم

کۆمەڵەی ١٦-١٧-١٨، وانەکانی"مێژوو ناسینی ئایینەکان"ە، ئەم کۆمەڵانە، وانەکانی دکتۆر شەریعەتی لە حسینیەی ارشاد لەبارەی دنیابینی یەکتاپەرستی،

فەلسەفەی مێژوو، بەراوردی ئیسلام لەگەڵ ئائایدۆلۆژیاکانی رۆژئاوا لەروانگەی سۆسیالیزم، مارکسیزم، بونگەرایی، سەرمایەداری و ئەوانی دی.

## کۆ بەرهەمی ژمارە( ١٩ ) "حسین" جێنشینی ئادەم

حسین جێنشینی ئادەم

پار

شەهیدبوون

پاش شەهیدبوون

باسێك سەبارەت بە شەهید

روانینی مێژووی شیعە

چاوەروانی، مەزهەبی رەخنەگرتن

فەلسەفەی مێژوو لە ئیسلامدا

پێشەکی مامۆستای شەهید لەسەر کتێبی حجری کوری عدی.

## کۆ بەرهەمی ژمارە( ٢٠ ) دەبێ چی بکرێت؟

پەیامی ئومێد بەرۆشنبیری بەرپرس

رۆشنبیرو بەرپرسیارێتی ئەو لە کۆمەڵگەدا

قوچەکی کۆمەڵناسی کلتوری

رێگەی سێیەم

خودئاگایی وگێلکردن

لەکوێوە دەست پێ بکەین؟

دەرهێنان و پاڵفتەکردنی سەرچاوە کلتورییەکان

دەبێ چی بکرێ؟

رۆشنبیری بەرپرس کێیە؟

پەیوەندی رۆشنبیر و کۆمەڵگە

پرسیارو وەڵام

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٢١ ) ژن

## فاتیمە، فاتیمەیە

چاوەروانی سەردەمی ئێستا لەژنی موسوڵمان

سیمیناری ژن

حیجاب

## کۆبەرهەمی ژمارە( ٢٢ ) مەزهەب دژی مەزهەب

مەزهەب دژی مەزهەب

دایك،باوك،ئێمە تاوانبارین

بەڵێ بەم جۆرە بوو برا

توین بی،شارستانییەت،مەزهەب

خواحافیز شاری شەهادەت

ئەگەر پاپ و مارکس نەبونایە

مێژگرد: وەڵامدانەوەی پرسیارو رەخنەکان

## کۆبەرهەمی ژمارە (٢٣) جیهانبینی و ئایدۆلۆژیا

یاداشتی بڵاوکەرەوە

جیهانبینی

جۆرەکانی دنیابینییەکان

چینەکانی هابیلی و قابیلی

دنیابینی یەکتا پەرستی و دنیابینی شیرك

پلەبەندی بۆرجوازو دنیابینی مادی

یەکتاپەرستی و شیرك

ناسینی یەکتاپەرستی

گرنگی یەکتاپەرستی

ئایدۆلۆژی(١)

جیاوازی ئایدۆلۆژی لەگەڵ زانست و فەلسەفە

جیاوازی ئایدۆلۆژی لەگەڵ مەزهەب

رۆڵی ئایدۆلۆژی لەسەدەی نوێدا

ئایدۆلۆژیا،تایبەتمەندی رۆشنبیرە

ئایدۆلۆژی(٢)پرسیارو وەلاّم

ئایدۆلۆژی(٣)

کلتورو ئایدۆلۆژیا

پیٚشەکی

١-کلتور

٢-شارستانییەت

کلتورو شارستانییەتی جیهانی

کلتورو شارستانیەتی نەتەوەیی

روانینی فەلسەفی

روانینی زانستی

روانینی تەکنیکی

روانینی سیاسی و کۆمەلاّیەتی

ویژدانی هونەری

ویژدانی عیرفانی و مەزهەبی

ئایدۆلۆژی(٣)

چۆنیەتی و بەهای ئەم خودئاگاییە

خستنەروی بابەت بەشیٚوەیەکی تر

ئایدۆلۆژیا چییە؟

کۆمەڵگای ئیسلامی

شارستانییەت لەمەدینە

خودئاگایی

حیکمەت چییە؟

ئەنجام

ئایدۆلۆژیا(٤)

ئایدۆلۆژیا(٥)

چاوەروانی "جەبری مێژوو،ویستی مرۆیی"

دیالێکتیک، دونیابینی ماددەگەرایی ویەکتاپەرستی

مرۆڤ،دروستکراوێکی دیالیکتیک

پێگەی چەمکە ئایدۆلۆژییەکان لەدو دنیابینی دژ

بەکارهێنانی وێنەی ماددی بۆ رونکردنەوەی چەمکە مەعنەوییەکان

خەبات لەگەڵ بتی دواکەوتن

دودڵی و گومانی رەنگاورەنگ لەدژی ئیسلامی شۆرشگێرانە

پاشکۆکان

پرسیارو وەڵام

پارانەوەی تابۆیی و پارانەوەی ئایدۆلۆژیك

کۆچکردن و شارستانییەت

ڕۆڵی هۆی کۆچکردن لەپێکهێنانی شارستانییەتی مرۆیی

کۆچی خاچ پەرستان و ڕاپەڕینی جیهانی

ئیسلام ژێرخانی بەرجەستەو،سەرخانی مەعنەوی

کاریگەری کۆچکردن لەدنیابینی مرۆڤ

چەمك و جۆرەکانی کۆچکردن لە قورئاندا

ناوەڕۆکی ڕاگەیاندن

## کۆبەرهەمی ژمارە (٢٤) مرۆڤ

مرۆڤ و ئیسلام

ئازادی

مرۆڤ و ئیسلام و قوتابخانەکانی ڕۆژئاوای زەوی

مرۆڤی ئازادو ئازادی مرۆڤ

مرۆڤ و مێژوو

ئەگزیستانسیالیزم

تەنیایی

فەلسەفەی دروستبونی مرۆڤ

## کۆ بەرهەمی ژماری ( ٢٥ ) مرۆڤی بیٚ خود

## مرۆڤگەرایی لە رۆژئاوا و رۆژهەلاٌت

## سەرکەشی مرۆڤ

چوار زیندانی مرۆڤ "کۆنفراس"

چوار زیندان مرۆڤ "وتار"

مرۆڤی بێخود

مرۆڤی تەواو

دواکەوتنی نویٚ

پێداویستیەکانی مرۆڤی ئەمڕۆ

قسەیەك لەبارەی کتێبەوە

ئارەزووەکان

کۆتایی غەم ئەنگێزی ژیانی "یۆنگ".

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٢٦ )، عەلی "ع"

وەرگێڕان و تەفسیری وتاری (٣٢)ی "نەهج البلاغە"

عەلی، حەقیقەتێك لەسەر شێوەی ئەفسانە

سەدەی ئێمە لە گەڕان بە دوای عەلیدا.

عەلی تەنیایە

چ پێداویستی و نیازێك بە عەلی

عەلی، بونیاتنەری یەکتایی

قاسگین، مارقین، ناکپین

پەیڕەوانی عەلی و رەنج و ئازاریان

عەلی، پاش مەرگ

ئوممەت و ئیمامەت

مێژوو و عەلی

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٢٧ )، جارێکی دی ناسینەوەی شوناسی ئێرانی – ئیسلامی

مێژووی ئێرانی ئیسلامی تاکو سەفەویە

گەڕانەوە بۆ خود

لە دایکبوونی دووبارەی ئێسلام لە روانینێکی خێرا بەدرێژایی سەدەیەك

درێغیەکان

شیعەگەر، میعادگای رۆحی سامی و رۆحی ئاریایی

موڵکی نزیك

## كۆ بەرهەمی ژمارە ( ٢٨ )، ریگەی ناسینی ئیسلام

عەرەب پێش ئێش ئیسلام

ریگەی ناسینی ئیسلام

هەندێك لە تایبەتمەندییەكانی كەسایەتی پێغەمبەر "ص"

لە كۆچەوە تاكو وەفات

توێژینـــــەوەی لــــــە هەنــــدێك لــــــە رووداوەكــــانی ســــەرەتای ئیســــلام

سـەلمانی پـاك توێژینــەوەیكی كـورتی بابــەتی ویلایــەت عەهـدی ئیمـام رەزا

قوتابخانەی پەروەردە و پەروەردەی ئیسلامی

خودا لە مەزهەبە جیاوازەكان

چەمكی جیهانبینی لە كۆمەڵگە كراوەكان و داخراوەكاندا

قورئان و كۆمپیوتەر

بنەماكانی تەقلید

پاكەكان و چاكەكان لە قورئاندا

جوگرافیای فەرهەنگی عەرەبستان

روانینێك بۆ قورئان

## كۆ بەرهەمی ژمارە ( ٢٩ )، میعاد لەگەڵ ئیبراهیم

میعاد لەگەڵ ئیبراهیم

وتارەكانی حەج لە ساڵی (١٣٤٩)

وتارەکانی حەج لە ساڵی (١٣٥٠)

مێژوو و بەهای لە ئیسلامدا

مێژوو، هێڵی ڕۆیشتنی پێکهاتەیی سروشتی مرۆڤ

کتێبی عەلی، کتێبی سبەینێ، کتێبی هەمیشە پێوەرە جێگیرەکان لە پەروەردە و فێرکردندا زانیاریە ئیسلامیەکان پێویستی ناسینی جۆرەکان لە نووسینی بایۆگرافی

مەرگ، پەیامێك بۆ زیندوان

## کۆ بەرهەمی ژمارە (٣٠)، ئیسلامناسی "زانکۆی مەشهەد"

مێژووی ئیسلام بە کەڵکی چی دێت؟

ئیسلام چیە؟

پایە بنەڕەتیەکانی ئیسلامی یەکەمین

موحەممەد "ص" کێیە؟

ژیانی موحەممەد "ص"

ناسینی موحەممەد "ص"

سیمای موحەممەد "ص"

## کۆ بەرهەمی ژمارە (٣١)، تایبەتمەندییەکانی سەدە نوێکان

مێژووی تەواوکاری فەلسەفە

ئەفسانەناسی زانست

ریشە ئابووریەکانی رێنیسانس

روانینێك بۆ تایبەتمەندییەکانی سەدە دێرینەکان، سەدەکانی ناوەڕاست و سەدە نوێکان

روانینێك بۆ مێژووی سبەینێ

سیکۆلاریزمی نوێ

ماشین لە کۆت و بەندی ماشینیزم

شارستانیەت و نوێگەری

دۆخی ئاگایی چینەکان

هەندێك پشتگیرانی "گەڕانەوە بۆ خود" لە جیهانی سێیەمدا

جیهانبینی داخراو، جیهانبینی کراوە

کۆچی زەمینە ساز

داروینیزم لە گۆڕانی بۆ جۆرەکانی شارستانیەکان بۆ یەکتر

دونیای سێیەم خۆی هاتۆتە زمان

بۆچوونی مەزهەب لە دیدی رۆشنبیری واقیعبین و رۆشنبیری تەقلیدکەر

نموونە بالاّ ئەخلاقیەکان لە ئیسلام

پێشەکیەك بۆ کۆنفرانسی "حسن الامین"

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٣٢ )، هونەر

هونەر لە چاوەڕوانی گەڕاوەیەکدا

مەزهەب "دەرگا"یەکە و هونەر "پەنجەرە"یەك

هونەر راکردنێك لەوەی "کە هەیە"

لە رەخنە و ئەدەبدا

"شانۆنامە" ستەم لەسەر پایەی عەدالەت

هەڵبژاردنێك لە شیعرەکان

شیعر چیە؟

پەند و حیکایەت

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٣٣ )، گفتوگۆکانی تەنیایی بەشی ( ١ و ٢ ).

کۆمەڵە دەستنووسێك لە خۆ دەگرێت کە بە زۆربەی ئەوانەن بە درێژایی ماوەی چالاکیەکانی لە حوسێنیەی ئیرشاد نوسراون و وەکو وتار وتراونەتەوە. ئەمەش دەسنووسەکانیەتی لە زەمینەی ژیاننامە و راڤەی ژیانی خێزانی و زانستی و سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی.

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٣٤ )، نامەکان.

ئەم بەرهەمە چەندین نامە دەگریتەوە وەك: هاوسەرو منداڵ و کەسانی نزیك و دۆست و دەزگاکان و ...هتد

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٣٥ )، بەرهەمە جۆراوجۆرەکان، بەشی یەکەم.

مێژوو – کۆمەڵگە

مرۆڤ

ناسینی ئیسلام

سەدەکانی ناوەڕاست – سەدە نوێکان

مەزهەب – عیرفان – ئامانجگەرایی

هونەر

گفتوگۆی تەنیایی

حسێنیەی ئیرشاد

نامەکان

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٣٥ )، بەرهەمە جۆراوجۆرەکان، بەشی دووەم.

منداڵان و لاوان

یەك لەبەردەمیدا تاکو ناکۆتا سفر

وتارەکان

نوسینە جۆراوجۆرەکان

وەرگێڕانەکان

یاداشتەکان

وێنەی هەندێك لە دەستنووسەکان

پەراوێزەکان

## کۆ بەرهەمی ژمارە ( ٣٦ )، بەرهەمەکانی لاوی

بەشی یەکەم: بەرهەمەکانی سەردەمی لاوی

ئەم بەشە نووسین و بابەتەکانی "د.شەریعەتی"ین لەتەمەنی لاویدا کە لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاّوکراونەتەوە.

بەشی دووەم: بەرهەمەکانی قۆناغی گەنجی و دواتر.

.

**تێبینی:** ئەم بابەتە بە هاوکاری خوشکی ئازیزم "روقیەخان" وەرگێڕدراوە.

سەرچاوە: سایتی دکتۆر عەلی شەریعەتی.

## بەرهەمەکانی

## "دکتۆر عەلی شەریعەتی "بە زمانە جیاوازەکان

### زمانی عربی:

١- **هكذا كان يا اخی** ، ترجمه سعيد علی، الناشر حسينيه ارشاد بطهران فی عام ١٩٧١

٢- **فاطمة هی فاطمة** ، ترجمه سعيد علی، الناشر حسينيه ارشاد

٣- **محمدﷺ خاتم النبيين** ، من الهجرة حتی الوفاة ، ترجمه ابو علی الموسوی، دارالهدی للنشر و التوزيع

٤- **الدعا** ، ترجمه سعيد علی، الناشر حسينيه ارشاد

٥- **الحرّ** ، ترجمه سعيد علی، الناشر حسينيه ارشاد

٦- **الانسان و الاسلام** ، ترجمه عادل كاظم، دارالسروش للطباعة و النشر

٧- **العودة الی الذات محاظرتان** ، ترجمه سميرة فطحی، دارالسروش للطباعة و النشر

٨- **منهج التعرّف علی الاسلام** ، ترجمه عادل كاظم، دارالسروش للطباعة و النشر

٩- **جدليه علم الاجتماع**

١٠- **المتفكر والمسئوليته فی المجتمع**، ترجمه ابراهيم سوق شتاءاليار الاسلامی

١١- **نظرة التوحيد للعالم الوحدة**

١٢- **الانسان الاسلام و مدارس الغرب** ، ترجمه عباس ترجمان، دار الصحف للنشر

١٣- **الانسان الاسلام** ، ترجمه عباس ترجمان ، دار الصحف للنشر

١٤- **الانسان و التاريخ** ، ترجمه خليل على ، دار الصحف للنشر
١٥- **سيماء محمد**ﷺ، ترجمه سيد جعفر سامى الدّبوني
١٦- **على وحدة و عدالت** ، للنشر لبنان
١٧- **الحج** ، حسينيه ارشاد
١٨- **النباهه، الاستحمار** ، ترجمه هادى السيد ليس آل بابيل الموسوى، مؤسسه الهدى للنشر و التوزيع

## زمانی کوردی:

١- **پدر مادر ما متهميم** ، ترجمه هه ژار
٢- **سيماى محمد**ﷺ، ترجمه صفى زاده
٣- **عرفان برابرى آزادى** ، ترجمه هه ژار
٤- **بازگشت به خويشتن** ، ترجمه صديق بوره
٥- **يك جلويش تا بى‌نهايت صفرها** ، ترجمه هه ژار
٦- آرى **اينحنين بود برادر** ، ترجمه هه ژار
٧- انسان، ترجمة موسعةب نةدهةم.
٨- دفترهاى خاكسترى، موسعةب نةدهةم.
٩- نيايش، ترجمة، موسعةب نةدهةم.
١٠- فرهنكى لغات، ترجمة، حسيَن سةيد نةدهةم

## نوردو

١- **شهادت** ، ترجمه سيد غلام حسنين كراروى
٢- آرى **اينچنين بود برادر** ، دانشگاه مشهد

۳- **خودسازی انقلابی** ، نمایندگی فرهنگی ایران در پاکستان
۴- **ما و اقبال** ، نمایندگی فرهنگی ایران در پاکستان
۵- **وصـــایت و شـــوری** ، نمایـــندگی فرهنگـــی ایـــران در پاکســـتان

## ئەندەنوسی

0 - **عشق و توحید**، انتشارات تبلیغ

## ئەلبانی

۱- **سیمای محمد** ، نمایندگی فرهنگی ایران در یوگسلاوی سابق
۲- **انســـان و اســـلام** ، نمایـــندگی فرهنگـــی ایـــران در یوگســـلاوی ســـابق

## تامیلی

۱- **حج** ، نمایندگی فرهنگی ایران در سریلانکا
۲- **روش شناخت اسلام** ، ترجمه ام. ای. فوزالدین

## تانی

۱- **آری اینچنین بود برادر** ، نمایندگی فرهنگی ایران در تایلند
۲- **جامعه شناسی اسلامی** ، نمایندگی فرهنگی ایران در تایلند
۳- **حج** ، نمایندگی فرهنگی ایران در تایلند
۴- **انتظار عصر حاضر از زن مسلمان** ، نمایندگی فرهنگی ایران در تایلند
۵- **از هجرت تا وفات** ، انتشارات الهدی

## بنگالی

١- نگاهی به تاریخ فردا ، ترجمه محمد عبدالله، انتشارات آینده بنگلادش
٢- شهادت ، وابستگی فرهنگی ایران در بنگلادش

## ئینگلیزی

1. **A Glance at Tomorrow's History**, 1985, p.24.

2. **An Approach to Understanding of Islam** , Trans, Venus Kaivantash (The Shariati, Foundation, and Hamdami Publishers, Tehran, 1979).

3. **And Once again Abu Dhar**, 1985, p, 75.

4. **Art Awaiting The Saviour** , Trans, Homa Farjadi (Shariati Foundation and Hamdami Publishers, Tehran 1979).

5. **Capitalism Wakes UP?I**, Trans Mahmoud Mogscni, (The Ministry of Islamic Guidance, Tehran, 1981).

6. **Civilization and modernization**, (Aligarh, Iranian Students Islamic Association, 1979).

7. **Culture an Ideology**, 1980, p.23.

8. **Fatima is Fatima**, Trans, Laleh Bakhtiar (Shariati Foundation and Hamdami Publishers, Tehran, 1980).

9. **From Where Shall we Begin and Machine in the Captivity of Machinism**, 1980, p.52.

10. **Hajj**, Trans, Ali Behzadnia and Najla Denny.

11. **Islamic View of Man**, Trans, Ali Behzadnia and Najla Denny.

12. **Man and Islam**, Trans, Ghulam M.Fayez (University of Mashhad Press, Mashad, Jahad Publications, 1982).

13. **Man and Islam**, Trans ; Dr. Fatollah Marjani (Free Islamic Literature-Filinc, Houston, Texas, 1981).

14. **Martyrdom, Arise and Bear Witness**, Trans, Ali Asghar Ghassemy (Ministy of Islamic Gudance, Tehran, 1981).

15. **Marxism and Other Western Fallacies**: An Islamic Critique, Tran's, R. Campbell (Berkely, Mizan Press, 1981).

16. **One Followed By An Eternity of Zeros** , Trans, Ali Asghar Ghassemy (The Hosseiniyeh Ershad and the Hamdami Publishers, Tehran, 1979).

17. **On The Sociology of Islam**, Trans", Hamid Algar (Berkely, Mizan Press, 1979).

18. **Red shiism**, Trans, Habib Shirazi (The shariati Foundation and Hamdami Publishers, Tehran, 1979).

19. **Retlection of A Concerned Muslim on The Plight of Oppressed Peoples**, Trans" , Ali Behzadnia and Najla Denny.

20. **Selection and of Election**, Trans, Ali Asghar Ghassemy (The Hosseniyeh Ershad and Hamdami Publishers, Tehran, 1979).

21. **The Visage of Mohammed**, 'Trans, A. A. Sachadin (Nor. Oqalam Publications, Lahore, 1983).

22. **Ye Brother, That's The Way it Was**, Trans, Nader Assaf (Shariati Foundations and Hamdami Publishers, Tehran, 1979).

23. **Awaiting the Religion of Protest** Translated by: Shahyar Saadat.

24. **What is to be done?** Edited & Anotated by: Farhang Rajaee/ Forword by: John L. Esposito.

25. **Martyrdom**, Trans, lale Bakhtiar and Hossein Saleh, (Abowzar faundation, Tehram, Iran).

26. **Hajj**, trans, S.M.Farough, (Islamic faundation, India, 1989)

## ئەڵمانی

1. **Die Vier Gefangisse des Menchen**, (Botschaft der Islamischen Republik Iran Press und Kulturab Teilung, Bonn Mai 1981).
2. **Die Kunst Menchtich Zu Sein**, (J.G. Blaschke Verleg A-, Austria, 1982).
3. **Die Umma**, (J.G. Blaschke Verlag A-Austria, 1982).
4. **Zivilisation and Modemismus**, (J.G. Blaschke, Verlag, A, Austria, 1982).
5. **Exploitation and Raffinierung der Kulturellen Quellen**, (J.G. Blaschke, Verlag, A, Austria, 1982).
6. **Zur Westlichen Demokratie**, (Bostchaft der Islamischen Republik Iran, Bonn, Marz 1981).
7. **Fatima ist Fatima**, (Bostchaft der Islamischen Republik Iran, Bonn, Marz 1981).
8. **Ja, So war es, Bruder!** Islamisches Fuhrungsminsterium Islamische Republik Iran.

## Italian

1. **Le Egtehad e la Teoria della Rivoluzion Permanente**, (Centro Cuttural Islamico Europeo, Roma, 1984).
2. **Sette discorsi di Ali Shariati**, (Centro Cultura! Islamico Europeo, Roma, 1984).
3. **Uno Seguito do Innumerevoli**, Zeri, Tra, Reza Moghaddam Centro Cultural Islamico Europeo, Roma, 1983).

## French

1. **Civilisation et Modernisaton** , Tra, Jean Manuel (Comite de Propagation International de la Revolution Islamique, Teheran, 1981).
2. **Oui, Frere Il En Etain Ainsi**, Tra, Jeam Manuel (Comite de la propagation de la Revolution Islamique, Teheran, 1981).
3. **Histore et Destinee** Textes traduites et presentes par N. Yavari et F.Hamed, Introduction de J. Breque, (Sindbad, Paris, 1982).

## Spanish

1. **EL ARTE A LA ESPERA Del SALVADORE**, Traducido Por R. Morales. EDITORIAL SOHOF.
2. **FATIMA ES FATIMA**: Publishers ALHODA.
3. **CULTURA E IDEOLOGLA**. Traducido Por R. Morales. EDITORLAL SOHOF.
4. **Algunas de las Caracteristicas. Resaltantes de la Personalidad del Profeta**. Traducido por R. Mora.
5. **SOCIOLOGIA. DEL ISLAM**. Traductor Gustavo Morales. edicion 1988 (Corregida aumentada).
6. **Y UNA VEZ MAS ABU DHARR**: Traducido Ada Conzales EDITORAL SOHOF.

## Turkish

1. Ali Aeriati, "**Ademin varisi huseyin**" turkcesi: ☐ ? istanbul-Akademi yayinlari.
2. Ali Aeriati, "**Ali siasi safevi siasi**" turkcesi: feyzullah artinili istanbul-yonelis yayinlari. 2. Baski: 1990, 269 sayfa.

3. Ali Aeriati, "**Anne baba biz sucluyuz**" turkcesi: kerim guney istanbul-seckin yayinctilik. 1. Baski: 1987 □? Baski: 1993, 138 sayfa.

4. Ali Aeriati, "**Ask ve tevhid**" turkes: ali rehavi istanbul-teblig yayinlari 1. Baski: 1986, 61 sayfa.

5. Ali Aeriati, "**Aydin**" turkcesi: ibrahim agacan istanbul-dunya yayincilik 1. Baski: 1990, 58 sayfa.

6. Ali Aeriati, "**Aydinlara umut cagrisi** (rom suresinden dersler). Turkcesi: ejder okumus istanbul-inkilab yayinlari 1. Baski: 1990, 93 sayfa.

7. Ali Aeriati, "**Ayet yorumlari (I)**" turkcesi: sabah kara, ankara-liyam yayincilik 1. Bski: 1990, 190 sayfa.

8. Ali Aeriati, "**Ayet yorumlari (II)**" turkcei: sabah kara, ankara-kiyam yayincilik.

9. Ali Aeriati, "**Ayet yorumlari (III)**", turkcesi: sabah kara, ankara-kiyam yayincilik.

10. Ali Aeriati, "**Bekleyis karsi tepki dini**" turkcesi: ramazan karaburcak, ankara-nuans yayinevi 1. Baski: 1991, 73 sayfa.

11. Ali Aeriati, "**Bilinc ve eseklestirilme**" turkecesi: □? Istanbul-endulus yayinlari.

12. Ali Aeriati, "**Bir onunde sonsuz sayda sifirlar**" turkcesi: ramazan karaburcak, ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1991, 47 sayfa.

13. Ali Aeriati, "**Biz ve ikbal**" turkcei: ergin kilictutan, istanbul-bir yayincilik 2. Baski: 1988, 173 sayfa.

14. Ali Aeriati, "**Cagin musluman kadindan bekledigi**" turkcesi □? Ankara-endise yayinlari + istanbul-objektif yayinlari.

15. Ali Aeriati, "**Dine karsi din**" turkcesi" prof. Dr. huseyin hatemi, istanbul-inaret yayinlari 4. Baski: 1993, 95 sayfa.

16. Ali Aeriati, "**Dinler tarihi (I)**" turkcesi: abdullah sahin, istanbul-yedigeckitaplari 1. Baski: 1988, □? Baski: 1992, 398 sayfa.

17. Ali Aeriati, "**Dinler tarihi (II)**" turkcesi: abdulhamit uzer, istanbul-yedigecekitaplari + istanbul-seckin yayincilik 1. Baski: 1990, 280 sayfa.

18. Ali Aeriati, "**Ebuzer-I gifari**" turkcesi: □? Istanbul-teblig yayinlari.

19. Ali Aeriati, "**Fatima fatimadir**" turkcesi: ismail babacan istanbul-dunya yayincilik 2. Baski: 1990, 199 sayfa.

20. Ali Aeriati, "**Hacc**", turkcesi: [fatih selim] istanbul - sura yayinlari 7. Bask: 1991; 198 sayfa.

21. Ali Aeriati, "**Her gicret bir inkilaptir**:, turkcesi: Hasan elmas, ankara-ihtar yayincilik 1. Baski: 1991, 95 sayfa.

22. Ali Aeriati, "**Hur dusunce mektebi**", turkcesi: ali seyidoglu, ankara birlesim yayin-dagitim 1. Baski: 1989, 111 sayfa.

23. Ali Aeriati, "**iki sure iki yorum**", turkcesi: s. naci karaarslan ankara-endise yayinlari 1. Baski: 1990, 104 sayfa.

24. Ali Aeriati, "**insan**", turkcesi: samil ocal, ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1990, 432 sayfa.

25. Ali Aeriati, "**insanin dort zindani**", turkcesi: prof. dr. huseyin hatemi, istanbul-isaret yayinlari 4. Baski: 1992, 80 sayfa.

26. Ali Aeriati, "**islam bilim (I)**", turkcesi: faruk alptekin, istanbul-nehir yayinlari 1. Baski: 1992, 577 sayfa.

27. Ali Aeriati, "**islam bilim**", turkcesi: □ ?, ankara-endise yayinlari.

28. Ali Aeriati, "**islami anlamak**", turkcesi: [orhan oguzhan] ve □? , istanbul-objektif yayinlari, 1. Baski: 1991, 51 sayfa.

29. Ali Aeriati, "**islam nedir (I)**", turkcesi: ali seyidoglu, istanbul-bir yayincilik 2. Baski: □?, 156 sayfa.

30. Ali Aeriati, "**islam sosyolojisi uzerine**", turkcesi: kamil can istanbul - zafer matbaesi 1. Baski: 1980.

31. Ali Aeriati, "**islam ve insan**", turkcesi: opgan oguzhan sivas-seyrań yayinlari 1. Baki: 1986, 47 sayfa.

32. Ali Aeriati, "**kapitalizm uyaniyor mu**", turkcesi: fikret yalcinkaya, istanbul-dunya yayincilik 3. Baski: 1990, 79 sayfa.

33. Ali Aeriati, "**kendini bilmek**", turkcesi: □ ankara-endise yayinlari.

34. Ali Aeriati, "**kendini devrimci yetistirmek**", turkcesi: malik ejder istanbulcizgi yayinlari 1. Baski: 1991, 249 sayfa.

35. Ali Aeriati, "**kendini yetistirmek**", turkcesi: guseyin sahin ankara - sahra yayincilik 1. Baski: 1989, 205 sayfa.

36. Ali Aeriati, "**Kevir**", turkcesi: muhammed nayif sayir, ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1992, 384 sayfa.>

37. Ali Aeriati, "**kurana bakis**", turkcesi: ali seyidoglu, ankara-fecr yayinevi 3. Baski, 1992, 124 sayfa.

38. Ali Aeriati, "**kultur ve ideoloji etrafinda konusmalar**", turkcesi: orhan bekin, istanbul-bir yayincilik 1. Baski: 1986, 174 sayfa.

39. Ali Aeriati, "**makaleler**", turkcesi: serdar islam istanbul-objektif yayinlari 1. Bask: 1993, 174 sayfa.

40. Ali Aeriati, "**marksizm ve diger bati dusunceleri**", turkcesi: fatih selimistanbul-bir yayincilik 4. Baski: 1988, 149 sayfa.

41. Ali Aeriati, "**medeniyet tarihi (I)**", turkcesi: ibrahim keskin ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1987, 312 sayfa.

42. Ali Aeriati, "**medeniyet tarihi (II)**", turkcesi: ibrahim keskin ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1987, 320 sayfa.

43. Ali Aeriati, "**medniyet ve modernizm**", turkcesi: ahmet yuksekoglu istanbul-bir yayincilik 4. Baski: 1985 5. Baski: □?, 211 sayfa.

44. Ali Aeriati, "**mektuplar**", turkecesi: muhammed said isjanbul-sura yayinlari 1. Baski: 1991, 222 sayfa.

45. Ali Aeriati, "**muhammed I taniyalim (islam nedir-II)** ", turkcesi: ali seyidoglu, ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1988, 175 sayfa.

46. Ali Aeriati, "**muhammed kimdir (islam nedir -II)**", turkcesi: ali seyidoglu ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1988, 343 sayfa.

47. Ali Aeriati, "**ne yapmali,** turkcesi: muhammed hizbullah, istanbul-bir yayincilik 3. Basi: 1990, 183 sayfa.

48. Ali Aeriati, "**oze donus**", turkcesi: kerim guney, istanbul - yedigecekitaplari 2. Baski: 1991, 461 sayfa.

49. Ali Aeriati, "**papa ve marx olmasaydi**", turkcesi: ali iskenders, konyayakin yayinlari 2. Baski: 1983, □?

50. Ali Aeriati, "**siret**", turkcesi: kerim guney, istanbul-yedigecekitaplari 1. Baski: 1991, 198 sayfa.

51. Ali Aeriati, "**sehadet**", turkcesi: kerim guney, istanbul-yedigecekitaplari 1. Baski: 1991, 198 sayfa.

52. Ali Aeriati, "**sia**", turkcesi: □? Ankara-endise yayinlari.

53. Ali Aeriati, "**toplumbilim uzerine**", turkcesi: kenan sokmen, istanbul-bir yayinctlilk 2. Baski: 1988, 128 sayfa.

54. Ali Aeriati, "**ummet ve imamet**", turkcesi: ahmet sait, ankara-fecr yayinevi 1. Baski: 1990, 128 sayfa.

55. Ali Aeriati, "**ve cevap veriyorum!**", turkcesi: m. emin cimendag intanbul-yedigecekitaplari 1. Baski: 1991, 191 sayfa.

56. Ali Aeriati, "**yarinin tarihine bakis**", turkcesi: orhan bekin, istanbul-akabe yayinlari 1. Bask: 1988 2. Baski: □?, 98 sayfa.

57. Ali Aeriati, "**Islam Sosylojisi, Uzerine**", Turkcesi, Kamil Can (Zafer Matbaesi Istanbul, 1980).

58. Ali Aeriati, "**Medeniyet Ve Modernizm**", Turkcesi, Fatih Salim (Islam Inkilabini Dunyaye Teblig Komitesi, Tehran, 1981).

Ali Aeriati, "**Papa Ve Marx Olmasaydi**", Turkcesi, Ali-Sabaheddin Yakin (Terran, 1982

## له "شەریعەتی"یەوە

### (لەبارەی مردنی شەریعەتی)

**ن. د.عبدالکریم سروش**

ئـەمڕۆ بیسـت و هەشـتی کـانونی یەکـەمی سـاڵی (١٣٨٤)ه، مـەرحوم "د.عـەلی شەریعەتی" لە (٢٩)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٣٥٦) هەتاوی لـە دونیـا دەرچـوو. ڕەنگە زۆرێك لە ئێوە یان هیچ یەك لـە ئێـوە لـە یادیـدا نـەبێت لـەو ڕۆژانـەدا و بـە تایبەت لـەو ڕۆژەدا و ڕۆژێ دوو ڕۆژ دواتـر، هـەر ئـەم بینایـەی کـە ئێسـتا ئێـوەی تێدایە و هـەر ئـەم شـەقامانەی دەورووبـەر چ قـەرەباڵغی و جەنجاڵیـەك بـوو وە چ کەسانێك لەم دانیشتنەدا بوون و چ قسە گەلێك لەو کۆبوونەوەیەدا کـران. جـەنابی "ئیحسان شەریعەتی" یەکێك لە قسەکەرانی ئەو دانیشتنە بوو و من بە تـەواوی لـە یادمە کە لە خاڵی خوارەوەدا و لە خوارەوەی دانیشتنەکەدا دانیشـتبووم و زۆرێـك لە دۆستەکانمان لـە ترسـی سـاواك بـە قیناعێـك بـە ڕوخسـارەوە لـەم دانیشـتنەدا ئامادەبیان هەبوو. ئەگەر بمەوێت ناویان بهێنم ناوی ئاشنا و ناسراویان تێـدا بـوو. لە یادمە بەڕێوەبەرانی "حوسەینیەی ئیرشاد" و سەرانی ئۆپۆزسـیۆنی دژی شـای ئێران لەوێ ئامادە بوون، هەروەها کەسانی تر لە چینە جیاوازەکـان کـە دوور بـوو لـە هـیچ دانیشـتنێکدا لـە تەنیشـتی یـەکتر و لەگـەڵ یەکدا دابنیشـن، لـەژێر ئـەم سـەقفەدا کۆبووبوونـەوە. کەسـانێك لـە فەرەنسـا، لـە ئـەمریکا، لـە وڵاتـە ئەوروپیەکانی تر و لە بەریتانیاوە لێرەدا ئامادەبوون. اغایان بەنی صـەدر، دکتـۆر

حەبیبی، صادق تەباتەبایی و ئیحسان شەریعەتی قسەیان کرد و بەتایبەت ئیحسان لەو ساڵانەدا زۆر لاو بوو و لە ئەمریکاوە گەڕابوویەوە و هەڵبەتە مەرگی باوکی گەلێك پەرێشانی کردبوو و قسەی کاریگەری دەکرد.

جەنابی "بەنی صەدر" لە قسەکانی خۆیدا ئاماژەی بە خاڵێك کرد و پشتی بە یەکێك لە نووسینەکانی خودی مەرحوم "شەریعەتی" دەبەست کە وتبووی: پێم دەڵێن هێندە کار مەکە، هێندە توند مەڕۆ، بەمجۆرە تەمەنت کورت دەبێت، ئەگەر بەمجۆرە و هێندە کار بکەی ناتوانی زیاتر لە پێنج ساڵ بە زیندوویی بمێنیتەوە. "بەنی صەدر" دەیگوت ئەو نووسینە چوار ساڵ و هەشت مانگ پێش مەرگی شەریعەتی نوسرا بوو و لەبەرئەوە ئەو پێشبینیانە بە تەواوی راست دەرچوو بوون.

هەموو ئەمانە ئەو دەنگانە بوون کە لە ژێر ئەم سەقفە و ئەم فەزایەدا باسدەکران و بەرز دەبوونەوە و گوێگران دەیان بیستن و چ دڵانێك بریندار و چ چاوانێك دەگریان. هیچم بیر ناچێت و فەرامۆش ناکەم. هەموو گروپەکان باوکی مەعنەوییان لە دەست دابوو. ئەو نیگا و روانینانەی تاکەکان بۆ یەکتریان دەکرد، روانینی قوڵ، گەلێك پڕ مانا و لە هەمان کاتدا خەمۆك و ترساو لە ئایندە بوو کە بەهۆی لە دەستدانی ئەم رابەرە چ شتێك دێتە پێشەوە.

لە بیرمە گروپە چەپەکان، فیدراسۆنەکان، کەسانیتر، هەموویان پەیامی سەرەخۆشیان ناردبوو. لە هەمان ئەو دیوارەی بەرامبەردا تابلۆیەك داکوترابوو کە (فیدراسۆنی فێرخوازانی ئێرانی، سەرەخۆشی مەرگی "شەریعەتی" خەباتگێڕی دژی رژێم) دەکەن. ئەمە دەستەواژەیەك بوو کە لەو کاتانەدا زۆر بەکار دەهێنرا. من ئەمەم بە تایبەت وت تاکو دەستەواژەی گوتارەکەم بە شێوەیەکی دیار خستبێتە پێشچاوتان. هیچ کەس نەیدەوت "عەلی شەریعەتی" خەباتگێڕی رێگەی

ئازادی یان خەباتگێڕی ڕێگەی دیموکراسی یان دیموکراسی بەناوبانگ ئەم گوتانە لەناودا نەبوون. ئەوەی گرنگ بوو و وەکو فەزیلەتێکی بێ مشتومڕ و لەسەرووی چۆن و بۆچی ئەوەوە قسەی لەبارەی دەکرا و لەبارەیەوە جەخت دەکرایەوە، هەر ئەم "خەباتگێڕیبوون"ە بوو کە لەو ڕۆژگارەدا هەمووانی دەخستە ژێر چەترێکەوە. لە یادمە خانمەکان لێرەدا سەراپا بوونیان هەبوو. منداڵی خودی خۆم کە هەر لەم "لەندەن"ەدا لە دایکبوو بوو، ئەم شوێنەی قەرباڵغ دەکرد بەرەو ئەملا و ئەولا دەچوو کە ئێستا ئەویش لێرە ئامادەیە. ڕۆژگارێکی سەیر بوو و یادهێنانەوەی ئەو ڕۆژانەش هەم سەروو ئاسایی یاردگاری سەرنج ڕاکێش و سەرسوڕهێنەرن و هەمیش گەلێ مانادار و پەند فێرکەر بوون.

مەرگی "شەریعەتی" بە جۆرێك لەناکاو ڕوویدا و لێدان و شۆکەیەکی بە ڕۆحی هەموو خەباتگێڕان و بەتایبەت منداڵانی موسوڵمان دروست کرد، کە لە ڕاستیدا وەسف ناکرێت. من لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا لە "لەندەن" بووم. مەرحوم جەنابی "موتەهەری" و مەرحوم جەنابی "عەللامە تەباتەبایی"یش لە "لەندەن" بوون. یەکێکی تر لە زانایان کە ناوبانگی کەمترە بەناوی جەنابی "کشفی" لە "لەندەن" بوو. ئەویش لە تایفەی فەیلەسوفان بوو و هەموویان ئێستا بە ڕەحمەتی خودا ڕۆیشتوون.

مەرحوم "موتەهەری" لە بنەڕەتدا حەزی نەدەکرد لەوەی لەو ڕۆژانەدا دەربکەوێت و تەلەفۆنێکی بۆ من کرد و پێی وتم: من نایەمە دەرەوە و نامەوێ دەربکەوم تاکو کەمێك شار کپ ببێتەوە و هەلچوون بنیشێتەوە. لە مەجلیسی ڕێزلێنان و پرسەی "شەریعەتی"یش ئامادە نەبوو. پاش ئەوە من سەفرێکی تا ڕادەیەك دوورو درێژم کرد بۆ "ئەمریکا" و لە دانیشتن و کۆڕ و کۆبوونەوە جیاوازەکانی ئەنجومەنە ئیسلامیەکان فێرخوازانی زانکۆکانی سەرانسەری "ئەمریکا"، لە ٧–٨ ویلایەتدا

قسەم کرد و دەمبینی کە مەرگی لەناکاوی مەرحوم "شەریعەتی" چ کاریگەرییەکی قوڵی لە سەر رۆحی ئەم لاوانە داناوە. لە راستیدا هەموویان پرسیاریان ئەمە بوو کە چی بوو؟ و هەڵبەتە هەموویان تورەبوون لە رژێم لەوەی کە بیریان دەکردەوە لێی داون و بەمجۆرە "شەریعەت"ی لەوان سەندۆتەوە و تووشی مەرگێکی لەمجۆرەی کردوە.

لە هەمان ئەو رۆژانەدا ئەم یاداوەریەم نووسی و جارێکی دیکە بۆتان باس دەکەم: (بەیانی (٢٩)ی مانگی کانونی یەکەم، یەکێك لە دۆستە خۆشەویستەکانمان کە لەم دانیشتنەشدا ئامادەنتەلەفۆنی بۆ کردم و بینیم دەگری. هەواڵی هاتنی دکتۆر "شەریعەتی" لە "فەرەنسا"وە بۆ "بەریتانیا"مان هەبووو بریار بوو سبەی ئەو رۆژە لەگەڵ دۆستاندا بۆ دیداری بڕۆین بۆ "ساوت همپتن"، بەلام هاورێکەم تەلەفۆنی کرد و بە گریانەوە ووتی: وەرە بڕۆین بۆ "ساوت همپتن" بەلام ئیتر لەگەڵ جەنازەی دکتۆردا رووبەڕوو دەبینەوە، چونکە ئیدی زیندوو نیە. بەویژانەوە بلێم ئەو ساتانە زۆر تاڵ بوون، زۆر.

لێرەدا یاداوەرییەك دەلێم کە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا لە زەینمدایە. سێ کەس بووین. بە رێکەوتین و بەرەو ئەو شوێنەی مەرحوم دکتۆر شەوی پێشتر لەوێ بوو بوو. دوو کچی مەرحوم دکتۆر، ئەو گەنج بوون، وەکو دوو چۆلەکەی پەژموردە، جلی مشکیان پۆشیبوو و لە تەنیشتی دیوارێکدا وەستابوون. غەم سەراپای روخساری داپۆشیبوون. چووینە ناو ژوورێکەوە و ئەو قەرەوێڵەیەیان پیشاندایین کە مەرحوم "شەریعەتی" لەسەری نوستبوو. وتیان تاکو درەنگانێکی شەو لەگەڵ ئێمە دانیشتبوو و قسەی دەکرد. تازە لە رێگاشەوە گەیشتبوو و لەسەرووی ماندوبوونیشەوە، دانیشت و دانیشت و چای خوارد و قسەی دەکرد و جگەرەی کێشا و ...هتد تاکو نزیکی سەحەر. پاش بانگی بەیانی نوێژی کرد و

ڕۆیشت بۆ پشوودان ژوورەکەی تاکو بخەوێت. کاتی خواردنی نانی بەیانی، ئەهلی ماڵەکە چاوەڕوانی مەرحوم دکتۆر بوون تاکو بێت و لەگەڵیاندا نان بخوات. دەیانوت نەهاتوو و درەنگی کرد. بانگمان لێکرد. وەلاّم نەبوو. ڕۆیشتین بۆ ژوورەکەی، وتیان کە چووینە ژوورەوە بینیمان کە دکتۆر بە دەم و چاو کەوتۆتە سەرزەوی. تەنانەت ئەو خاڵەی ژوورەکە کە شوێنی لووتی دکتۆر لەوێ هێشتا دیار بوو، پیشانیاندایین، بە تەواوی دیار بوو ئەو کاتەی ویستویەتی لە سەر تەختەی نوستنەکەیەوە بێتە خوارەوە، دڵی ئازاری بۆ پەیدا بووە و دەستی خستبوویە سەر دڵی و ئیتر نەیتوانیبوو کۆنترۆڵی خۆی بکات بە رووی دەم و چاودا کەوتبویە سەرزەوی.

بە هەر حاڵ بە بینیی ئەم دۆخە راستەوخۆ ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنیان ئاگادار کردبوویەوە و پیاوانی فریاکەوتنیش تاکو هاتبوون، لە هەمان ئەو شوێنەدا سەرنجیان لە نیشانەکانی ژیانی مەرحوم دکتۆر دابوو و دیارییان کردبوو و وتبویان (١٥) خولەکە وەفاتیان کردوە و لە هەمانکاتدا بە پەلە بەرەو نەخۆشخانەی "ساوت همستن" یان بردبوو. ئێمەش ڕۆیشتن بۆ نەخۆشخانە، دکتۆریان بردبوو بۆ ژووری شۆردن و ڕێگەیان نەدا ئێمە بچینە ئەو ژورە. من کارتی خوێندکاریم پێ بوو و لەبەرئەوە لەسەری نوسرابوو دکتۆر فلاّن، وایان زانی من پزیشکم ڕێگەیاندا بچمە ئەو ژوورەوە و لەگەڵ دۆستان چووینە ژوورەوە. دوو جەنازەی تێدا بوو، یەکەمیان لادایەوە تاکو جەنازەکەی دکتۆرمان پیشان بدەن، بەلاّم هی ژنێك بوو، جەنازەی دووەمیان پیشاندایین کە جەستەی مەرحوم دکتۆر بوو. زۆر زۆر هێمن و ئارام خەوتبوو. لە راستیدا من کەمتر روخسارێکی ئارامی لەو جۆرەم بینیبوو. موەکانی سەری تاکو سەرشانەکانی هاتبوون و سەروو ئاسایی ئارام خەوتبوو.

جەنابی "میناچی" کە لەگەڵماندا بوو، ڕۆیشتە پێشەوە و بەهۆی ئەوەی بریکار بوو و لەگەڵ کۆمەڵێك کاروبار ئاشنایی هەبوو، کەمێك هەوڵیدا تاکو بە وردی سەیر بکات و بزانێت ئایا زامێك یان کاریگەری لێدانێك یان شتێك لەسەر جەستەی دکتۆر دەردەکەوێت یان نا؟ کە لە ڕاستیدا هیچ شتێك دەرنەکەوت. ڕوخسارێکی زۆر ئاسایی هەبوو، تێکنەچوو بوو، چاوەکانی لێکنابوو و چوو بوویە ناو خەوێکی بەنازی ئەبەدیەوە.

هاتینە دەرەوە و گەڕاینەوە بۆ "لەندەن" و دۆستەکانی ترمان ئاگادار کردەوە. بە هەرحاڵ پێشەکی و کارەکانی سەرەتای مەراسیمی پرسەی مەرحوم دکتۆر ئەنجامدران. کۆمەڵێك لە دۆستان لە سەرانسەری دونیاوە – بەو جۆرەی کە وتم– هەموویان ئاگادار کرانەوە و یەك لە دوای یەك، لێرەو لەوێ گەیشتن. لەو ڕۆژانەدا "لەندەن"، ڕۆژانێکی زۆر قەرەباڵغی تێدەپەڕاند و هەموو ئەو کەسانەی کە لەو کاتەدا ناوێکیان هەبوو و لە دژەکانی بەناوی ڕژێمی شا بوون، لێرە کۆبووبوونەوە.

هەر لەم کاتانەدا جەنابی "شەبستەری"یش کە ئیمامی مزگەوتی "هامبۆرگ" بوون، بە بێ ئەوە ئاگایان لە ڕووداوێکی لەم جۆرە بێت، بەرەو مەنزڵی یەکێك لە دۆستەکان کە هەموو ئەوانیتر لەوێ بوون، هاتبوو. بە منیان وت کاتێك هاتم، بینیم هەموو ڕوخسارەکان داگیراون. من ئاگام لێنەبوو چی ڕوویداوە، بەڵام کە چوومە ناو دانیشتنەکەوە، بینیم دانیشتنێکی نائاساییە. کاتێك پێیان وت مەرحوم "شەریعەتی" لە دونیا دەرچووە، بە شێوەیەکی زۆر سروشتی ئامێکی هەڵکێشا و وتی: عەجەب! دکتۆر "شەریعەتی" یش پەیوەست بوو بە مێژووەوە و لە ڕاستیدا بە مێژووەوە پەیوەست بووبوو.

بە هەرحاڵ شتە سەرتاییەکان ئەنجام دران و بە پێچەوانەی ئەوەی کە بەناوبانگ بووجەنازەی مەرحوم "شەریعەتی"، لێرە واتە لە "امام بارە" نەشۆرا، بەڵکو لە یەکێك لە مزگەوتەکانی "لەندەن" کە مزگەوتێکی بچوك و تایبەت بوو بە ئەهلی سوننەوە و شوێنی شۆردنی هەبوو، شۆردرا. بەندە و جەنابی "شبستەری" شۆردن و کفنکردنی خرایە ئەستۆمان، واتە لە راستیدا دۆستان داوایان لە جەنابی "شبستەری" کردبوو و ئەویش بە منیان وت: وەرە پێکەوە ئەمکارە بکەین، هەڵبەتە دوو کەسی تر یارمەتیاندراین ئەوانیش جەنابی دکتۆر "ئیبراهیم یەزدی" و جەنابی "صادق قوتب زادە" ئەم چوارە کەسە بووین کە مەرحوم دکتۆریان هێنا. ئیدی جەستەی دکتۆر سەلامەت نەبوو، سەراپا پشکنی بوو، سەروو و جەستەیان پشکنی بوو، نموونەیان لێدەرهێنابوو و توێژینەوەی پزیشکی زۆر جیدییان لەسەر ئەنجام دابوو.

نەخۆشخانەی "ساوس هیمپتۆن"، راپۆرتێکی دوور و درێژی پزیشکی لەبارەی مەرگی دکتۆرەوە بلاوکردەوە و تیایدا وتبویان، شتێکی گوماناوی نەبینراوە و مەرگیش بە هۆی بۆ نموونە، کوشتن، دەستێك، ژەهر و ...هتد شتێکی لەمجۆرە نەبوو و وا پێدەچوو کە بە مەرگی سروشتی لە دونیا دەرچوو بوو. مەرگی سروشتی واتە بە هۆی جەڵتەی دڵەوە. وا رێکەوت هەر ئەو رۆژەی رۆیشتین بۆ "ساوس هیمپسۆن" و بۆ یەکەمجار لەگەڵ جێگەی خاڵی مەرحوم "شەریعەتی" رووبەڕووبووینەوە و پاشان رۆیشتین بۆ نەخۆشخانە، لە هەمان ئەو ژوورەی کە مەرحوم دکتۆر خەوتبوو، سەتڵێك بوو کە نزیکەی (٤٠) پاشماوە و جگەرەی سوتاوی تێدا بوو، واتە لە هەمان ئەو کاتە کورتەدا، مەرحوم دکتۆر بڕێکی زۆر جگەرەی کێشا بوو. پزیشکانی دانیشتووی دانیشتنەکەمان باشتر لە من دەزانن کە لە حاڵەتی توندی و گرژی توندی دەمارەکان و ئەو فشارەی دکتۆر لەو رۆژانەدا

تیایدا بوو، هۆکاری حاڵەتێکی لەمجۆرە بووە، بە تایبەت ئەو شەوە پێش رووداوەکە مەرحوم "شەریعەتی" بەرەو فڕۆکەخانەی "هیثرو" رۆیشتبوو، چونکە بڕیار بوو کچەکانی بێن، هەموو رێبواران هاتبوون جگە لە کچەکانی ئەو. دۆستێکیان وتی، دکتۆر سەرووئاسایی دڵەراوکێ بوو بوو، چونکە خێزانەکەی لە تەلەفۆندا پێی وتبوو کە کچەکان لە گومرگ و بەشی کۆنترۆڵی پاسپۆرت تێپەڕبوون و بەرەو فڕۆکە رۆیشتوون. کاتێک کچەکان نەهاتبوون، ئەو زۆر بە توندی تووشی دڵەراوکێ بووبوو کە نەوەکو فێڵێك لەم نێوەندەدا بوونی هەبێت و بەناوی سواربوونی فڕۆکەوە کچەکانیان رێنوێنی کردبێت و بەرەو شوێنێکی تریان بردبن و بۆ نموونە گلیان دابنەوە یان خستبنیانە زیندانەوە. هەموو ئەم بیرۆکانەی بەسەردا هاتبوون و ئەو سەروو ئاسایی ئاڵۆز بوو بوو. هەڵبەتە کچەکان هاتبوون و لەگەڵیدا رۆیشتبوون بۆ "ساوث هیمبثن". ئەم فشارە رۆحیانە بوون و دواتر بوو بوویە هۆی کێشانی ئەم هەموو جگەرەیە کە من وا گومان دەبەم بە باشترین روویەك دەتوانین هۆکاری ئەو وەستانی دڵ و جەڵتەی دڵی لەناکاو روون بکەینەوە.

جەستەی مەرحوم دکتۆر شۆردرا و رایە ناو تابوتێکەوە. لە هەمان ئەو رۆژانەدا وا رێکەوت جەنابی "شێخ مەهدی شەمس الدین" کە سەرۆکی مەجلیسی باڵای شیعەکانی لوبنان بوو، لە لەندەن بوو. لە یادمە گفتوگۆیەکمان لەگەڵ دۆستاندا ئەنجامدا و من بەبەرپرس دانرام کە لەگەڵ جەنابی "شێخ مەهدی شەمس الدین" قسە بکەم و داوای لێ بکەم کە بڕوات بۆ "سوریا" و "لوبنان" لەگەڵ "حافیز ئەسەد"دا قسە بکات تاکو بە مۆڵەتی ئەو و هاوڕایی ئەو جەنازەی مەرجوم بەرەو "سوریا" بگوازرێتەوە و بەمجۆرەش ئەمکارەم کرد. لە فڕۆکەخانە جەنابی "شمس الدین" پێی وتم راستەوخۆ لێرەوە دەچم بۆ "سوریا" و گفتوگۆی پێویست دەکەم. بە هەر حاڵ ئەمکارانە ئەنجامدران و جەنازەی مەرحوم دکتۆر بەرەو "سوریا" گوازرایەوە،

بەڵام لە شەقامەکانی "لەندەن" هەواڵێکی تر هەبوو و شتێکی تر دەگوزەرا. ئەمکارانەی کە عەرزمکردن هەمیشە لە پشتی پەردەوە ئەنجام دەدران. لە شەقامەکانی "لەندەن" ژمارەیەکی زۆر لە فێرخوازان و لایەنگرانی مەرحوم "شەریعەتی" کۆبوبوونەوە و تابوتێکیش لە پشتیانەوە دەجوولا. هەڵبەتە ئەم تابوتە خاڵی بوو و جەنازەی دکتۆری تێدا نەبوو، چونکە ترسی ئەوە هەبوو کەسانێك پەیدا ببن و بێ حورمەتی یان هەر ووداوێکی نەخوازراو ئەنجام بدەن.

ئەو وێنە و ڤیدیۆیانەی هی ئەو کاتەی لەبەردەستدان گەر بیانبینن، بە تەواوی دیارە کە زۆرێك لە خەڵکی، سەروروخساری پێچراو و بە هاوار و خرۆشاوەوە بەرەو ئەو تابوتە هێماییە دەڕۆن. بۆ "ئیمام بارە" هاتن، واتە هەر ئەم شوێنەی کە ئێستا تیایدان، کۆبوونەوەیەکی شکۆدار بە ئەنجام گەێنرا و پاش ئەوە هەڵبەتە کۆبوونەوەی زۆر لە بەریتانیا و وولاتەکانی دیکە ئەنجامدرا و هەموویان یادی مەرحوم "شەریعەتی"یان بە زیندوویی راگرت. لە هەمووی کاریگەرتر، دانیشتن و کۆبوونەوەیەك بوو کە لە "مەشهەد" ئەنجامدرا و باوکی مەرحوم دکتۆر لەو دانیشتنەدا هەبوو و وتەیەکی کورت، بەڵام بە دەستەواژەی "فیردەوسی" پڕ لە ئاوی چاو، لەوێ باسکرد کە کاسێتی ئەو وتارە بە خێرایی لە هەموو شوێنێکەوە بڵاوبوویەوە.

سەرچاوە: کتێبی "از شریعتی"، ن. د.عبدالکریم سروش، موسسه فرهنگی صراط، تهران، چاپ دوم، ١٣٨٥، ص ٢٤٨-٢٥٥.

# شەریعەتی، بیرمەندی ئازادی

ن: د. ئیحسان شەریعەتی*

ئەی سەرووتر لە خەیاڵ و پێوانە و گومان و وەهم و لە هەموو ئەوەی وتویانە و بیستمان و خوێندومانەتەوە !

بابەتی قسەی من ئەمڕۆ، توێژینەوەی کۆتا پەیامی "شەریعەتی"یە لە کۆتاییەکانی ساڵەکانی تەمەنی پڕ بەرهەمی ئەودا، لە بڕگەیەك کە من خۆم لە پێکهاتن و دروستبوونیدا شانازی ئامادەگی و بەشداریکردنم هەبوو، واتە لە دایکبوونی سێ سیانەی (ئازادی، بەرامبەری، عیرفان) لە ساڵی (١٣٥٥)، واتە ساڵێك پێش کۆچی لە ئێران.

بە بۆچوونی من بۆ بەدواداچوونی ئەم پرۆژەیە کە پێی ئاشنان، بەهێزی ڕێگەی شەریعەتی" کە وەکو من "شەریعەتی" تەنها وەکو کتێبك ناناسێت، ئەگەر دەبێت لە حەوزەی تاکەکەسیەوە بە عیرفان دەست پێ بکات، لە حەوزە و بواری کۆمەڵایەتی بە خەبات لەگەڵ ئازادیدا دەست پێ دەکات. دەزانین کە "شەریعەتی" لەمەودوا ئازادیخوازی و لە بەرامبەری ئەودا کە مامۆستای "شۆڕش"ەکان بوو، هەندێجار لە ڕووی تیۆردارێژەرانی "سیستەم"ەکان، رەخنەی لێگیراوە و من ئەمڕۆ هەوڵدەدەم ئەوە پیشان بدەم بۆچی "شەریعەتی" بیرمەندی ئازادیە و خودی ئەم ئازادیە چیە؟ هەروەها لە چوار پایەی سەرەکی و

فەلسەفیدا جیهانبینی "شەریعەتی" واتە لە یەزداناسی، مرۆڤناسی، فەلسەفەی مێژوو و کۆمەڵناسی، بۆچی و چۆن ئازادی دەروازە و روانینی رێگەی ئەوە؟

١- خودای شەریعەتی (یەزدانناسی یان ئیلاهیاتی رزگار بەخش):

خودای هەر کەس خوو و نەریتی ئەوە. "هراکلیت" دەیوت: خوو و نەریتی هەر کەسێك خودای ئەوە. (ئاتوس – ئەنترۆپوس– دیمون). خودای "شەریعەتی"، خودای قورئان، خودای عیرفانی ئێران، ئازادی رەها یان باڵایە (لە هەر شتێك رەنگی پەیوەستیبوون هەڵبگرێت). ئازادی باڵا یان باڵابوونی رەها "تعالی مگلق" یەکەمین تایبەتمەندی خودای ئەوە. لە لایەکی ترەوە، ئەو خودایەکە هەر لەم "نزیکی"یانە. لە رەگی بناگوێ لە من نزیکترە کە ئونس و نزیکین لێیەوە، دۆستی گوێگری ئاشنا و هاوەڵی باڵا "رفیق اعلی"یە. "هراکلیت" لەبەردەم تونورێکدا دانیشتبوو کەسانێکی ژیر کە بۆ هاتنی ئەم فەیلەسوفە مەزنە هاتبوون و سەریان لەم دۆخە ئاساییە سورمابوو و سەرنجیان دەدا و حەکیمیش بانگهێشتی کردن تاکو هەر لەو شوێنەدا دابنیشن و ووتی: (خودا، هەر لەو جێگە و شوێنەدایە، گۆرەپانی ولابوونی ئەمری پیرۆز، هەر لەم جۆرە ژیانەدا و شوێنی نیشتەجێبوونی هەڵبژاردنی ئێمە.)

"هیگڵ" دەیوت: بۆ ناسینی گیانی نەتەوەیەك دەبێت خودایان بناسیت. جەنگی "ئەسکەندەر" و "دارا" خەباتی "زیۆس" و "ئاهورا" بوو. مێژوو ئەگەر جەنگی مەزهەبە دژی مەزهەب، ئەم مەیدانە جەنگی خودایانە. "هیگڵ" دەیوت: (گەل و نەتەوەیەك کە خودایەکی خراپیان هەیە، یاسا و رێسای خراپ و ... حکومەتێکی خراپیان هەیە). وێنای خودای ئیسلام بە وتنی "نە" بە خودایانی "ئازادی لە" و بۆ گەیشتن بە ئازادی "ئازادی بۆ، رزگاربوون و سەرکەوتن" دەست پێدەکات.

"الا"، پەرستشی خودا، (مەحکومیەتی مرۆڤە بە ئازادی)یە، "سارتەر" و شۆرشی زەوی.

پاش بەدیهێنانی بوون، ئەم خودای بەدیهێنەرەی مرۆڤ دەبێت تاکو لە تەنیایی بێتە دەرەوە و گوێگرێك بدۆزێتەوە. بوونەوەرێك بەدی بهێنێت و دروست بکات تاکو لە سەر زەویدا گەندەڵی و خوێنرێژی ئەنجام بدات؟ "فریشتەکان"، شتێك دەزانم کە ئێوە نایزانن! وە عاشقترین فریشتەکان بە خودا، شەیتان، شەیتانیبوون مۆڵەتی لە عیشق وەرگرت. خوداش مرۆڤی دروستکرد و درەخت یان میوەی قەدەغەکراو و شەیتانیبوونی عیشق تاکو مرۆڤ لە بەرامبەریدا بوەستێت و ئازاد بێت. لێرەوەیە مافی هەڵبژاردن، بەرپرسیاریەتی گوناه، خێر و شەڕ و توانای هەموو بەهاکان.

بۆیە مرۆڤ نە فریشتەیە و نە ئاژەڵ. ئەو لە نێوان (احسن التقویم و اسفل سافلین) دوو رووگە و دوو لایەنە. لایەن و رووگەیەکیان بۆ خۆی و خودی خۆی (رزگارم بوو، رزگاری رزگار بوو و بینیم کە منم بەشداری هیچ کەس ناکەم، منم وەکو جەزیرەیەك لە چوار لاوە سنووردار بە خودی خۆم. جیهان و ئەوەی تێیدایە لە ژێر پێیەکانمدا و هیچ کەسێك لە کەنارمدا و هیچ لەسەر سەرم، چ دەسەلاتێکی پڕ شکۆی خودایی! ... بوومە بوون و شۆراوە و سپی بوومەوە و گلێکی بێ شێوە و لە دەستی ئازادییەکانی خۆمدا و لە ژێر قەڵەمی زێڕینی ئەو! ئەو؟ ئەو کێیە؟ خۆم، خودی ئازادی بەخشم، پەروەردگارم... مەگەر نا هەر کەسێك بەو ئەندازەیەی کە دروستکەری خۆیەتی...؟

لەبەرئەوە خودا، من – منەکان، گیان – جیهان، خودی – جیهانی بوون "ئیقباڵ"، خودای (مرۆڤێکە کە بۆ ئەم خودا گەڕاوەتەوە، لە ئەوپەڕی بێخودی بۆ خودی خۆی و ئیدی شایستەیی ئەوەی هەیە پێی بڵێین لە کەعبە تێپەڕە! چونکە

ئەو خاوەنی ئیرادە و توانای سەرکەشی و لەبەرئەوە بەرپرس و دروستکەری وێنای خۆیەتی. واتە ئەوەی مرۆڤگەراکان "هیومانیستەکان" و بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیست"کان هەوڵدەدەن تاکو بە ئینکاریکردنی خودا، مرۆڤ بەوە بگەیێنن). لێرەدا "شەریعەتی" هۆشیاری و ئاگاداری دەدات کە (ئەگەر بمانەوێت ئەم جیهانبینیە "عیرفانی"یە لە چوارچێوەی یەکێك لە قاڵبە زیهنیەکان (مرۆڤگەرایی، ناخ گەرایی، بوونگەرایی) بگونجێنین خیانەتمان لە حەقیقەت کردووە. چونکە بە ناچاری دەبێت ئەم بابەتە بسڕینەوە، چونکە بنەڕەتیترین تایبەتمەندی ئەم جیهانبینیە مرۆییە نەبوونی قاڵبە (کۆ بەرهەم. ١١٩،١٣) و خوداش لێرەدا بریتیە لە کۆمەڵێك تایبەتمەندی باڵای رەها "متعالی مگلق": بەهاکان واتە مانای بوونی مرۆڤ و ئەو تەواوکارییانەی پێوەری تەواوکاری ئەون و خودا کۆی هەر ئەم بەها هاوبەشانەی نێوان مرۆڤ و خودا، جیلوەی خود ئاگایی، دروستکردن، داهێنان، زانستی ئەوە). لەم جیهانبینیەدا، ناتوانرێت مرۆڤ جیاواز لە خودا دابنرێت و بزانرێت ئەگەر جیهان مانای نەبێت، قسەکردن لەبارەی مانای مرۆڤەوە وەهم و شتێکی وەهماویە.

٢- ئازادی، پێناسەی مرۆڤ (مرۆڤناسی):

ئازادی یەکێکە لە سیفەتە دیارەکانی مرۆڤ، هەروەك ئاگایی، ئیرادە و دروستکردن نیە، بەڵك بنەڕەتیترین سیفەتی جوێکەرەوەی و لە بنەڕەتدا پێناسەی ئەوە، چونکە مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکە لە بووندا کە ئازادە.

الف- مرۆڤ بوونی ئازاد، یان ناچارکراو :مجبور" و مەحکومە بە ئازادی. بوونەوەرێکی کەوتوو یان نیشتووەوە کە چیەتی "ماهیت"ی خۆی، خۆی دروستی دەکات. ئەم پێشکەوتنەش جیاکەرەوەیەکی میتافیزیکی نیە، چونکە چیەتی "ماهیت"ی مرۆڤ کتومت هەمان بوونی ئەوە و بوونی ئەو ئازادی، بوونی ئەو، بە

دەستەواژەی "هایدگەر"، "لە" جیهانبوون (سروشت و مێژوو)، "لەگەڵ" ئەوانیتر بوون (کۆمەڵگە)، و "خود" بوونە.

ب- خودگەری خود، خودی رەسەن، "من کامەم؟"، (بنەڕەتیترین پرسیاری کەویریات)، بریتیە لە دوور کەوتنەوە و بینین و روانینی خود لە دەرەوە. خود وەکو "ئەویتر" بینین "پۆل ریکۆر" و پاشان "گەڕانەوە" بۆ خود و خودبوون "دۆزینەوەی شوناس". بۆیە شوناسی پێشوو، بۆماوەیی، سوننەتی، نەتەوەیی، ئاینی بوونی نیە. بەڵکو دەبێت بەرەو شوناسبوون و یان شوناسازی و شوناس دۆزینەوە نێوان دوو "خود" رووبەڕووین. مرۆڤ شتێکە بەرامبەر بە خۆی. مرۆڤ بوونەوەرێکە کە لە خۆی سەرووتر دەڕوات و بە دەستەواژەی "نیچە"، "دەبێت" لەو سەرووتر بڕوات (مرۆیی، سەروتربوونی مرۆیی). بۆ نموونە پەیوەندی خود - مرۆیی لەگەڵ شوناسی نەتەوەیی لە شێوەی راستی و دروستیدا، نەك پیاهەڵدانی شوناس بەمانای خودێکی پێشتر دروستبووی نەژادی - نەتەوەیی، بەڵکو دروستکردنی پەیوەندییەکی رەخنەگرانەیە، وایە لە دەرەوە لەگەڵ دەرککردنی هەروەك ئایدیایەکە. ئەمەشە مانای گەڕانەوە بۆ خود کە تیۆریای تایبەتی "شەریعەتی" نەبووە و پێش ئەویش لە لایەن کەسانی تری وەکو "جەلال" و ...هتد خراوەتەڕوو. "شەریعەتی" خۆی لە پێشەکی "گەڕانەوە"دا دەنوسێت، شوناسی نەتەوەیی و شارستانی ئێمە لە بنەڕەتدا هیچ کات نەفی نەبووە تاکو (وەك وڵاتە ئەفریقیەکان و ...هتد)، "شوناسگەرایی" پێویست بێت. تیۆریای تایبەتی "شەریعەتی" نەك گەڕانەوە بۆ خود، بەڵکو باس لە جۆرێك گۆڕان و هەڵگەڕانەوەشیەتی لە سیستەمی رابردووشدا و "گەڕانەوە بۆ کام خود"ە.

٣- فەلسەفەی مێژوو، "زانستی بوون بە" مرۆڤ: پاش دابەزینی مرۆڤ لە بەهەشت (لە حاڵەتی تاکەکەسی)یدا بەرەو بیابان (مێژوویەك کە بە شێوەی جوگرافیا

دەرکـەوتووە و بـە تایبـەت لـە ڕۆژهەڵاتـدا جۆرێـك هیچـگەرایی ڕۆژهـەڵاتی دروسـتکردوە)، دەتـوانین فەلسـەفەی مێـژووی "شـەریعەتی" لـەم تەوەرانـەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

الف- ڕۆیشتنی ئـازادی ڕۆح لـە جـەبرە پێوسـتەکانیان بـە دەسـتەواژەی ئـەو لـە "چـوار زینـدان"ی، سروشـت، مێـژوو، کۆمەڵگـە و دەروون. لـە قۆنـاغی یەکەمـدا گـۆڕینی هێـزە دەروونییـەکان "تـرس، تـەماع و هەڵپـەکردن و وەهـم" بـۆ سیستەمەکانی "زۆر و زێڕ و تەزویر" و ئەمەش نەك تەنها وەسفی ئەدەبی، بەڵکو لـە ڕووی زانستیشـەوە "ئایـدۆلۆژیای سـێ بەشـی کۆمەڵگـە هینـدی - و - ئەوروپیەکان"ە. کە "جۆرج دومزیل" لێکۆڵەری گەورەی فەرەنسی پیشانی داوە.

ب- سەرەو ژێربـوونی مێـوو: لـە قۆناغـەکانی سـەرەتادا، خـودا هێشـتا ڕاسـتەخۆ دەست دەخاتە چارەنووسی مرۆڤەوە و بە ناردنی پرۆمیتەکان یـان پێغەمبـەران و بـە سـروش "وەحـی" بـەرەو تـەواوکاری دەبـات تـاکو قۆنـاغی خاتەمیـەتی "موحەممەد" "ص" و خەتمی وەحی یـان سـەربەخۆیی عـەقڵ (بـە دەسـتەواژەی ئیقبال) و تـاکو "غەیبـەت" بـە (دەسـتەواژەی شـەریعەتی)، قۆنـاغی تـەواوبوونی ئیمامـەت، ڕێبـەری کاریمـایی و سـەربەخۆیی بۆچـوونی خـەڵکی یـان دیموکراسـی پەیماندراو و ڕێنمونیکراو لە لایەن ڕۆشنبیران یان "زانایان"یەوەیە.

ج- غەیبەت، چاوەڕوانی خۆشـی و فەلسـەفەی مەهدەویەتـە بـەرەو نێودەوڵـەتی ئازادی و عەدالەتی نەتەوەکان. لە جیهانەکەی تر و باشـتر (ئالتـەر - مۆنـدیالیزم) لە بەرامبەر جیهانسازی تۆڕی تەکنیکی سەراپای زەوی سەرمایەداری جیهانخۆر.

٤- ئازادی لە کۆمەڵگە یان فەلسەفەی سیاسی "شەریعەتی"

الف- "شەریعەتی" باوەڕی وایە شۆڕشی فەرهەنگی لە پێش شۆڕشی سیاسی و ئازادی بەخشەوەیە. چونکە نائاگایی لە مافەکان، ڕێگری هاتنەدی دیموکراسییە بە تایبەت لەو کۆمەڵگەیانەی لە حاڵی فراوانبووندان. لە کۆمەڵگەیەکی شارستانیدا، ڕەخنەی ئاین پێش مەرجی هەر ڕەخنەیەکی ترە. بۆیە نوێگەری (ڕێنیسانسی فەرهەنگی و ریفۆرمی ئایینی) بەرنامەی سەرەکی رۆشنبیرە.

ب- گەڕان بە دوای یەکسانی نێوان دیموکراسی سیاسی "لیبرالیزم" و دیموکراسی کۆمەڵایەتی "سۆشیالیزم" تایبەتمەندی و خاڵی جیاکەرەوەی فەلسەفەی سیاسی "شەریعەتی"یە بۆ کۆمەڵگە. ڕەخنەی ئەو لە لیبرالیزم لەسەر بەشی دووەمی ئەم قوتابخانەیە کە لە حاڵەتی شۆڕشی سەرەتا بەرەو پارێزگاری دەڕوات و ئازادیخوازی تەنها بە "سوودی ڕێگری" کەمینە دەبێت. بۆیە ڕەخنەی "شەریعەتی" لە لیبرالیزم لەسەر دوو لایەن و بواری "داگیرکاری "ئیمپریالیزم" و بەرهەمهێنان "کاپیتالیزم"ە، لە هەمانکاتدا "شەریعەتی" بە دوی "ئیقبال"دا ماف و ئازادییە مرۆییەکان قبوڵ دەکات، نەک تەنها قبوڵیان دەکات، بەڵکو ئەمانە بە لایەنی کەمینە دەزانێت.

بە کورتی "شەریعەتی" هەروەک "ئیقبال" کە پاش دواکەوتنی خەلافەتی "عوسمانی" سیستەمی "کۆماری" بە ناونیشانی گونجاوترین سیستەمی ناسراو بۆ فەلسەفەی سیاسی ئیسلامی هاوچەرخ قبوڵ دەکات. لەبارەی دیموکراسیش تەنانەت لە شێوەی کەمینەی لیبراڵیەکەیدا، واتە قبوڵکردنی بنەماکانی وەکو "فرەیی" (پلورالیزمی فیکری - سیاسی)، لێبوردن و ئەلتەرناتیڤ (مافی کەمینە بۆ گۆڕینی بە زۆرینە).

ئەم لایەنگیریە ڕوەو ئازادییەکان و مافەکان لە فەلسەفەی سیاسی "شەریعەتی"دا لە بۆنە و نەریتەکانی نێوان هزری مرۆڤەکاندا بە ناونیشانی بوونەوەری ئازاد کە لە

دۆخی ئاساییدا بۆ "مرۆڤ گورگی مرۆڤ" دەتوانن بگۆڕدرێن و یان بە قبوڵکردنی سیستەمی "ماف" بەرەو دۆخی "مەدەنی" دەگەن.

بەڵام "شەریعەتی" بیرمەندی ئازادیە بۆ "ژیان". ئەو فێرخواز و مامۆستای "چۆنیەتی ژیان"ە، نەك چۆنیەتی مردن، "بمرە و بمرێنە"، یان مەرگ و جەنگ و توندوتیژی. چونکە فەلسەفەی شەهادەتی ئەو نەك خەبات، کە دیوێکی لاوەکی هەیە، بەڵکو پەیامی - خوێن - ی "حسێن"ە لە نەی زەینەب"وە هەڵدەستێتەوە. هەر بەو جۆرەی کە "تشیع" ئەگەر پەیڕەوی لە نموونەی ئیمامی ئازادی و مرۆڤی باڵا "نەك سەروو باڵا"، ناوی دیکەی بەنی "فاتیمە" و لە وەچەی ئەم شێرە ژنە گیان ئازادەیە. هەر بەو جۆرەی ئیسلام بە پشتیوانی "خەدیجە" پەروەردە بوو.

بە کورتی: ئازادی چیە؟ (ئاگایی لەوەی کە نیمە)، واتە هەستکردن بە بەندی و "رزگاری لە" شوێن و پێگەی زیندانیکراو (پێناسەی نەرێنی ئازادی) یان رزگاری "لە" بە مانای "لیبراڵ" و تاکو ئازدای، رزگاری یان سەرکەوتن کە (ئازادی بۆ) (پێناسەی ئەرێنی ئازادی)یە.

ئاگایی خود چیە؟ هەمان ئەوەی لە فەلسەفەی حەج لە ناسینی زانستیەوە دەست پێدەکات و لە دایکبووی عیشقە و تەنها سوپایەك لە جیهاندا کە تیایدا هەر سەربازێك فەرماندەیە و عیشق لە ترۆپکیدا "خۆشەویستن"ە و هەموو ئەمە جۆرێك خودئاگاییە تێکەڵ بە کردار (ئێمە و ئیقباڵ).

(عیشق لێرەدا، ریشەی دەرکەوتنی قوتابخانە عیرفانیەکانی و مەزهەبیەکانە، جیلوەیەك لە هەمان ئەوە و لە کەناری ئازادیدا، تایبەتمەندییەکی زۆر باڵا کە تەنها لەو خودا و نیاز و پێویستی بوونی مرۆڤە، کە لە سەرمایەداریدا لەناو دەچێت و لە سۆشیالیزمی دەوڵەتیدا دەبێە یەك رەهەند. ئەگەر ئەم سێ بوارە لە تەنیشت

یەکەوە بن، گەورەترین شت پێشکەش بە مرۆڤ دەکرێت کە: (دڵێکی وەکو "عیسی"تان هەبێت، ئەندێشەیەکی وەکو "سوکرات" و دەستێك وەکو دەستی "قەیسەر"). بەڵام لە مرۆڤێکدا ... لەبەر بنەمای رۆحێك و بۆ گەیشتن بە ئامانجێك.

(من هەردووکیانم دەوێت، هەم عیشق و هەم ئازادی. دڵم دەکەمە قوربانی عیشقم و عیشقیشم دەکەمە قوربانی ئازادی).

بەڵام ژیان چیە؟ (نان، ئازادی، فەرهەنگ، ئیمان و خۆشویستن). گەڕان بە دوای "حەقیقەت و جوانی": (حەقیقەتی ئایینم، بوون و رێگە رۆیشتن. نا، بوویە ژیانم و کارم. جوانی بوویە عیشقم و بیانووی ژیان و ژیانکردنم.)وە چۆنیەتی ژیان؟ رێگە رۆیشتن ئایینی حەقیقەت کە زانست دروست دەکات. مانەوەی کار، ئایین – خێر کە ئەخلاق دروست دەکات. بیانووی ژیان، جوانی دۆستی و دۆستایەتی کە هونەر دروست دەکات. لەسەر "پەرستگە"دا "شەریعەتی" نووسیویانە: (هەر کەسێك بێ هونەرە، نەیەتە ناوەوە! دواجاریش "شەریعەتی" لە "کۆنفۆشیوس"ەوە دەگوازێتەوە: (ئەوەی ژیان ناناسێت، چۆن دەتوانێت لەبارەی مەرگەوە، مەعریفەت بەدەست بهێنێت و ئەوەی توانای خزمەتی زیندووانی نیە، دەتوانێت چ خزمەتێك بە رۆحی مردووەکان بکات؟)

٦- پێویستی زیندوو راگرتنی یادی "شەریعەتی" ئەمڕۆ بۆ ئەوانەی پارێزگارانی رێگەکەی ئەون، پارێزگاریکردنە لەوەی تووشی سێ نەخۆشی "نیچە"یی نەبێت:

١- رووکردنە "شەریعەتی" هەروەك شتێکی مێژوویی، "شەریعەتی" جەستەیەك، شەقان، مۆزەخانەیەك و ...هتد نیە.

٢- هۆشیار بین لەوەی سۆز و هەستی پاکمان لە وێناکردن و بەرجەستەکردن و دروستکردنی کەسایەتی وا لە ئەو نەکەین بیکەینە خاچ و شێوە بتێك. قۆناغەکان و زەمینە جیاوازەکان فەرامۆش نەکەین، واتە نەکەوینە ناو هەڵەی تەقلید و دووبارە کردنەوەوە.

٣- نەکەوینە ناو بیانووی ئینکارکردنی شێوە رەخنەو و شێوە رۆشنبیرانەوە یان نەکەوینە داوی شاردنەوەی حەقیقەت، رێگەی هەڵە و شتانی گومانـاوی نەگرینەبەر.

بەڵێ رێگەی چوارەم، رێگەی "شەریعەتی" زیندوو و زیندوو کردەوە، پەیامی "شەریعتەتی"یە بە "لە دایکبوونێکی تر"، هەر بەو جۆرەی کە لە دایکبوونی دیکەی "شەریعەتی" بە "ئەبوزەر" (اجتماعیات)، قوتابخانەی مام ناوەند (اسلامیات) و جارێکی دی خوێندنەوەی مەسنەوی (کەویریات)، دەستی پێکرد. واتە هەمان شێواز و رێگەی پاکگەرایانەی سوننەت بە شێوەیەکی گشتی و لێرەدا "سوننەتی شەریعەتی" بۆ ئێمە. چونکە ئەگەر بیرمەندی ئازادیە، فێرکاری و مامۆستاییە کە ئێمە فێر دەکات کە دەتوانین لە بەرامبەر ئەودا و رێگەیەکی سەرەوە، بیر بکەینەوە.

"شەریعەتی" بەندەی خودای ئازادی یان "رەببی قەڵەم"ە. خودای مامۆستایەك کەقورئان بە بانگهێشتنی ناوی ئەو دەست پێدەکات، لەم روەوە، فێرکاری ئێمە نەك بە ناونیشانی ئەندێشە و بیرۆکەیەك لە کتێبەکاندا، بەڵکو فێرکاری رێگە و شێوازی ئازادی، بەرامبەر و عیرفانیە کە هەمان جیهان - ئاگایی، کۆمەڵگە - ئاگایی و خود - ئاگایی یە.

بۆیە ئێستا زۆر لە جێگەی خۆیدایە تاکو تۆ قەڵەم، تەوتەمت بوو، دەستت کرد بە قەڵەم و قەڵەمت لە دەست لانەبرد، بڵێین کە:

ئەی مامۆستا و فێرکاری ئازادی،

پیرۆزی ئازادی!

بڵێ هەر ساتێك لە کوێیت، چی دەکەی، تاکو بزانین ئەو ساتە لە کوێ بین، چی بکەین؟

یان ئەوەی ئێمە لەبەردەم خۆتدا بخوێنیتەوە، یان ئەوەی تۆ لەبەردەمی خۆمان بخوێنینەوە!

وە بە یادی هاوارەکانی خەڵکی لە سەرەتای شۆرشدا:

ئەی مامۆستای شەهید! ئەی سەرەتای بێداری! دژی داگیرکاری، دژی ستەمکاری، دژی بەرهەمهێنان، دژی ئیستیحماری!

بۆ ئەمڕۆی ئێمە بخوێنە! دووبارە بخوێنە!

بخوێنە بەناوی گوڵی سوور لە سپێدەی شەو

کە باغەکان هەمویان بێدار و بەرهەمدار بوون

بخوێنە دووبارە بخوێنە تاکو کۆترانی سپی

دووبارە بۆ هێلانەی خوێناوی بگەڕێنەوە.

"دکتۆر ئیحسان شەریعەتی" کوڕی "د.عەلی شەریعەتی"یە و لە ساڵی (١٣٣٨) لە مەشهەد لە دایکبووە، یەکەمین منداڵی "د.شەریعەتی"یە. بەشی فەلسەفەی زانکۆی "سۆربۆن"ی "فەرەنسا"ی تەواو کردوە. نامەی دکتۆراکەی بەناونیشانی (شوێنکەوتنی سیاسی فەلسەفەی هایدگەر و هەڵسەنگاندنی خوێندنەوەی ئێرانی لای "ئەحمەد فەردید"ە). ئێستاش لە "تاران" دەژی.

ماوەیەك بە ناونیشانی مامۆستای میوان لە گروپی فەلسەفەی "زانکۆی تاران" و "زانکۆی ئازادی ئیسلامی" وانەی وتۆتەوە.

بەرهەمەکانی:

١- فەلسەفەی "هایدگەر و خوێندنەوی ئێرانی"، تاران، انتشارات گام نو، ١٣٩٠.

٢- "ئایین و دەوڵەت"، پاریس، انتشارات ارشاد، ١٣٦١.

٣- "فەلسەفەی خودی لە ئەندێشەی ئیقباڵی لاهوری" پاریس، انتشارات ارشاد، ١٣٦٢.

٤- "تیۆریای نەفس"، "ئیبن سینا"، سیمینار، زانکۆی پاریس، ١٣٦٤.

٥- "فەلسەفەی سیاسی فارابی"، راڤەی ریسالەی "سیاسە المدنیە" و وەرگێڕانی بۆ فەرەنسی، ١٣٧٠. ئەمانە و چەندین لێکۆڵینەوە و وتار و نووسینی تر.

تێبینی: ئەم بابەتە لە ساڵی (١٣٨٨)دا نووسراوە.

سەرچاوە: پێگەی "دکتۆر عەلی شەریعەتی"

## لەبارەی دکتۆر "عەلی شەریعەتی"یەوە
## گفتوگۆ لەگەڵ موستەفا مەلەکیان

پ: دکتـۆر "شـەریعەتی" لـە سـەرەتای کتێبـی بیابـان "کـویر"دا دەڵێـت: نووسـینەکانم سـێ جـۆرن: (اجتماعیـات، ئیسـلامیات و کویریـات). ئـەوەی تـەنها خەڵکی پەسەندی دەکات" بابەتە کۆمەڵایەتیەکان "اجتماعیـات"ە و ئـەوەی هـەم من و هەمیش خەڵکی پەسەندی دەکەن: "ئیسلامیات" و ئەوەی خۆم قایل و رازی دەکات و هەست دەکەم کە لەگەڵیدا نەك کار — وە چی دەڵێم — نـەك نووسـەری، بەڵکو دەژیم: "کویریات"ە. بەڵام وا پێدەچێت ئەم روخسارەی "شـەریعەتی" کـە لە "کویریات"دا دەیبینین لەگەڵ ئەو روخسارە بـەجێماو و فـەرمی تـرەدا کـە لـە زەینی خەڵکیدا جێگیر بووە و دروست بـووە، هێنـدە هـاوخوانی و سـازگاری نیـە. تەنانەت هەندێك کەس ئەم روخسارە لـە بەرامبـەر روخسـاری زیـاتر ناسـراوی ئـەو وێنا کراوە و دەکەن، هەڵسەنگاندنی ئێوە چیە؟

و: سەرەتا دەمەوێت عەرز بکەم، بە بۆچوونی من نـە ئـەو دابەشـکارییەی "دکتـۆر شەریعەتی" لە کۆبەرهەمەکانی خۆیدا بۆ سێ بەش واتە، (اجتماعیات، ئیسـلامیات و کویریات) ووردە و نە ئەو داوەریکردنەی لەبارەی ئـەم سـێ بەشـەوە کردویـەتی کـە بـۆ نموونـە وتویـەتی: بابەتـە کۆمەڵایەتیـەکان "اجتماعیـات" تـەنها خـەڵکی پەسەندییان دەکەن و ئیسلامیات هەم خۆم و هەمیش خەڵکی و "کویریات" تـەنها

خۆم. ئەم دابەشکاری و حوکمەی کە بۆ ئەم سێ بەشە ئەنجامی داون بە بۆچوونی من وورد و تەواو نین. بۆچی؟

چونکە ئەو دابەشکارییەی کۆ بەرهەمەکان و ئەوەی لە "دکتۆر شەریعەتی" یەوە ماوەتەوە دابەشکردنی بۆ ئەم سێ بەشە راست و دروست نیە، چونکە ئەو "ئیسلامیات"ەش کە "دکتۆر شەریعەتی" دەیگوازێتەوە، ئەگەر نەڵێین لە سەداسەد، بەڵام زیاتر لە (٪۹۰)ی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان "ئیجتماعیات"ە. واتە ئەوەی لەبارەی ئیسلامەوە گواستویەتیەوە، کە دەکرێ بوترێ جۆرێك راڤە و درێژەدان و روونکردنەوە و باسکردنی دەقی پیرۆزی ئایینیە و لە راستیدا جۆرێك تەفسیری نوێ لەو ماددانەیە کە خەڵکانیتریش تەفسیرگەلێکیان لەم بابەتانەدا هەبووە و بەدەستیانەوە داوە و "دکتۆر شەریعەتی" یش مەبەستی بووە، تەفسیری تایبەتی خۆی بە دەستەوە بدات و ئەمانەش گەر نەڵێین لە سەداسەد تاکو رادەیەك نزیکەی (٪۹۰)ی لە دوو توێی ئەو بابەتە کۆمەڵایەتیانەدایە.

لەبەرئەوە ناتوانین بڵێین کە ئێمە ئیسلامیات و "ئیجتماعیات"مان هەیە، بە دەستەواژەیەکی تر لەبارەی "کۆمەڵایەتی و کۆمەڵ"ەوە دەکرێ دوو کۆمەڵ و دەستە قسە بکرێت: کۆمەڵ و دەستەی یەکەم ئەو قسەیە بینایە لەسەر دەقەکانی سروش "وحی" و دەستەیەکیش قسەکردنە لەبارەی کۆمەڵەوە، دەکرێ بوترێ بینا لەسەر دوایین بەرهەم و دۆزینەوەکانی زانستەکان و زانیارییە مرۆییەکانە. بۆ نموونە کۆتا دۆزینەوەکان کە گریمانەی ئەوە بکەن کۆمەڵناسان، یان ئابووریناسان، یان زانایانی سیاسەت و نموونەی ئەمانە لێیان تێگەیشتوون. ئەم دوو دەستە و تاقمە لە رووی بابەتەوە، بابەتی کۆمەڵناسین، دواجار بابەتە کۆمەڵایەتیەکان کاتێك لە دیدگای ئیلاهیاتەوە توێژینەوەیان لەبارەوە ناکەین و لەرووی زانستەکان و بەدەستهاتەکانی مرۆییەوە لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە دەکەین،

واتە لە روانین و روانگەی فەلسەفی، زانستە مێژوییەکان، زانستە ئەزموونیەکان و لەم دیدگایانەوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە بابەتە کۆمەڵایەتیەکان دەکەین. لێرەدا ئێمە لەگەڵ بابەتە کۆمەڵایەتیەکاندا سەرووکاریمان هەیە، بەڵام ئیدی لە رووی ئیلاهیاتەوە سەیری بابەتە کۆمەڵایەتیەکان ناکەین، بەڵکو لە رووی فەلسەفی یان مێژوو یان نموونەی ئەمانە سەیریان دەکەین. وەگەرنا ئێوە سەیری هەموو "ئیسلامیات"ی "دکتۆر شەریعەتی" بکەن، لە کوێ و چ شوێنێکدایە کە خەریکی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان نەبووە؟ لە کۆتاییدا ویستویەتی بڵێت لێرەدا من من خەریکی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان دەبم، بەڵام لە دیدگا و روانینی ئیسلام و دەقی پیرۆزی ئایینی و دواجار لەو دیدگا و روانینەی کە من بە ئیسلامی یەك، یان ئیسلامی دوو و یان تەنانەت بە ئیسلامی سێ باسی دەکەم و خستومەتەڕوو.

پ: ئێوە بۆ یەکەمین جار لەچ ساڵێکدا بیابان "کویر"تان خوێندەوە؟ ئەو کاتە چ کاریگەرییەکی لە ئێوەدا هەبوو؟

و: یەکەمین جار ل ساڵی (١٣٥٢) کە تازە چوو بوومە زانکۆ. من دەتوانم بڵێم کە یەکێك لە کاریگەرترین ئەو کتێبانەی کە لە درێژایی تەمەنمدا خوێندومەتەوە (لەو کاتەدا)، کتێبی بیابان "کویر"، "دکتۆر شەریعەتی" بوو، (کویریات، ئەو دەستەواژەیە ئەمڕۆ بەکاری دەهێنین) کە زۆر منی لە رووی هەست و سۆز و هەژاندنەوە بە خۆیەوە خەریك کرد، منی خستە ناو بەند و سنووری خۆیەوە، شتێکی بۆ دروستکردم و بە کەسایەتی "دکتۆر شەریعەتی"یەوە پەیوەستی کردم. لە راستیدا کاریگەر بوو. لە ساڵەکانی دواتردا کە زیاتر ساڵەکانی پاش شۆرش بوو، من چەندین جار ئەم کتێبەم خوێندۆتەوە و تەنانەت تاکو ئەم دواییانە. گومانی تێدا نیە ئەو سەرنج راکێشیەی کە لە جاری یەکەمی خوێندنەوە بۆ من بوونی هەبوو، هەرچی زیاتر دووبارە بوویەوە، کەمتر بوویەوە. بەڵام

هێشتاش کاتێك من بیابان"کویر" دەخوێنمەوە، زۆر بۆ ئەو بەهایە قایلم و هێشتاش کاریگەی لەسەرم هەیە. لەگەڵ ئەوەی بە بۆچوونی من کاریگەردانان لە کەسێکی (٥٧)ساڵ (مەبەستی لە خۆیەتی کە تەمەنی (٥٧) ساڵە) کارێکی ئاسان نیە، بەلاَم لە راستیدا تەنانەت هەر ئەم چەند رۆژەی رابردوو کە دەمخوێندەوە زۆر کاریگەری تیادا دروستکردم. بەلاَم لە زەینی مندا لە نێوان کاریگەری ئەرێنی "کویریات" و کاریگەری ئەرێنی بەشەکانی تر، بەرامبەرییەك دروست دەبێت. بە بۆچوونی من هێما و نیشانەی ئەمری "کویریات"، لە سێ شتدایە: یەکەم ئەوەیە دیارە بابەتی قسەکردن لە "کویریات" ئەو بابەتانەن کە بە بابەت گەل، یان بۆچوون گەل و یان کێشەی هەبوون "بوونگەرایی – ئەگزیستانسیال" مرۆڤ باسی لێوە دەکەین و دەری دەبڕین. ئەم بابەت و کاروبار و کێشەگەلی لایەنی کاتی، شوێنی و دۆخ و حاڵیان نیە. هەموو مرۆڤێك ئەم بابەت و کێشە بوونگەرایانە لە هەر ئایین و مەزهەبێکدا، لە هەر تەریقە و ئایینێك، لە هەر قوتابخانە و رێرەوێك، لە هەر مەشەرەب و مەرامێك، لەگەڵ هەر ئایدۆلۆژیایەك بە پەیوەستبوون بە هەر ناوێکەوە، لە هەر برگە و حاڵەتێکی مێژوویی و لە دامێنی هەر فەرهەنگ و شارستانیەتێك کە بەسەر دەبات و دەگوزەرێنێت، رووبەرووە. تاکو رادەیەك دەتوانرێ بوترێ ئاماژە بە هەموو ئەم بابەتانە کراوە. (تاکو رادەیەك هیچ بابەت و کێشەیەکی بوونگەرایی نیە کە لە شوێنێکی "کویریات"تدا ئاماژەی پێ نەکرابێت) لەبەرئەوەش پەیوەندی بە کۆمەڵگەیەکی تایبەت و کان و شوێنێکی تایبەتەوە نیە، دەتوانن بۆ هەمووان سەرنج راکێش بن. بە پێچەوانەی ئەو بابەتەی تایبەتە بە ئێرانیەکان، ئەویش ئێرانیە شیعەکان.

هۆکاری دووەم ئەمری "کویریات" پەخشانی دڵنشینیەتی. ئەم پەخشانە دڵنشینە، هەڵبەتە لە بەرهەمەکانی تری "دکتۆر شەریعەتی"یشدا خۆی

پیشاندەدات. "دکتۆر شەریعەتی" لە بنەڕەتدا ئەدیبە و هەمیشە قسە و وتارەکان و نووسینەکانی، لایەنی ئەدەبی دیارییان هەیە. بەڵام بە هەرحاڵ لە "کویریات"دا جیلوەی جوانی هونەری بەرهەمەکانی "دکتۆر شەریعەتی" دیارە، ئەمەش لە رووی هونەری و جوانیناسی سەرنجڕاکێشانی فراوان فەراهەم دەکات.

خاڵی سێیەم: "کویریات" جیلوە و دەرکەوتەی کەسایەتی و سروشتی "دکتۆر شەریعەتی"یش پیشاندەدات. واتە مومکینە منیش لەبارەی تەنیایی قسە بکەم، منیش لەبارەی عیشقەوە قسە بکەم، بەڵام ئەو شتەی لە کەسایەتی و سروشتی من لە شێوازی قسەکردن و خەریکبوون و دەربڕینم لەمەڕ عیشق و تەنیایی جیلوە دەکات و دەردەکەوێت، بەبەراورد بەو شتەی کە لە نووسینی "دکتۆر شەریعەتی"یدا جیلوە دەکات و نومایان دەبێت، مومکینە زۆر جیاوازی هەبێت. من بیر دەکەمەوە لە راستیدا هەندێك لە جیلوەکانی کەسایەتی "دکتۆر شەریعەتی" هەر مرۆڤێکی فەزیلەتمەند و خاوەن فەزیلەتی ئەخلاقی و هەر مرۆڤێك کە لەرووی دەروونناسیەوە تەندروست بێت، رادەکێشێت. بە دەستەواژەیەکی تر مرۆڤ خۆزگە دەخوازێت کە خۆزگە منیش دەمتوانی لە وتنێك و هەواڵێکی راستگۆیانە، باشی خۆم بکەم. ئەم سێ خاڵ و بوارە بوونەتە هۆی ئەوەی کە "کویریات" نەمرترین بەشی لە بەرهەمەکانی "شەریعەتی" بن.

پ: شەریعەتی لە بەرهەمەکانیدا ناوی بیرمەندان و نووسەرانی جیاواز و قوتابخانەی جۆراجۆر دەبات و ئاماژەیان پێ دەکات. لە "کویریات"دا کە کەڵکەڵەی بوونگەرایی خۆی روون دەکاتەوە، ئاماژە بە فەلسەفەی بوونگەرایی و بە تایبەت بوونگەرایی "ئەگزیستانسیالیزم"ی "سارتەر" دەکات. ئەو فێرخوازی فەلسەفە نیە و بە سەرنجدان بە بیرۆکە و ئەندێشەکانی رەنگە سروشتی تر بێت کە بە لقی نا بێباوەڕی بوونگەرایی "ئەگزیستانسیالیزم" سەرنجی زیاتر بدات و

کەسانی وەکو "کیرکەگۆر و ...هتد، بەڵام لە "کویر"دا (١٥)جار ئاماژە بۆ "سارتەر" دەکات و جارێکیش بۆ "کیرکەگارد"، بە بۆچوونی ئێوە ئەو تاکو چ ئەندازەیەك ئاشنایی لەبارەی ئەم لقەی فەلسەفەوە هەبووە؟ ئەمە بۆ من گرنگە، چونکە بیردەکەمەوە هەندێجار ئەم چەمکانە لەگەڵ چەمك گەلی دیکەی وەکو عیرفان تێکەڵ دەبێت کە نیازمەند و پێویستی بە ناسینی وورد هەیە. بۆ نموونە لە "خودسازی شۆرشی"دا (بوزا و حەللاج و مەزدەك"ی (بە سەرنجدان لە مارکس) لە یەك کەسایەتی دیکەدا کۆی کردۆتەوە و هەروەها شوێنگەی رۆشنبیری رۆژهەلاتی لەمەڕ هاوکارە رۆژئاواییەکەی لەرووی مایە و هەبووەکانەوە بە شت گەلی نایاب دەزانێت. هەڵسەنگاندنی ئێوە چیە؟

و: خاڵی یەکەم ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك لە رەخنەگرانی ئەدەبی رۆژگاری ئێمە هەبێت، لە هەمانکاتدا فەیلەسوفیش بێت و لە فەلسەفەکەیدا لایەنگری بۆ بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیزم"ی هەبێت و لە هەمانکاتدا خاوەنی شێوازێکیش بێت لە وێنەکێشاندا، ئێوە پەیوەندیتان بە چ بەشێکەوە هەیە و لە چ بەشێك سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگرن، دەبێت هەمان ناو بەرن. واتە ئەگەر لە بۆچوونێك سوود لە رەخنەی ئەدەبی ئەو وەردەگرن، نابێت بڵێین کە من دەمەوێت لە بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیزم"ی ئەو سوود وەربگرم. ئەو رەخنەگری ئەدەبیە، بەڵام لە مەیدان و بواری فەلسەفەدا، بوونگەرایە. ئەم دوانە پەیوەندییان بەیەکەوە نیە، کاتێك وێنە دەکێشێت بە پێویست شێوازی و رێگەیەگی لە وێنەکێشاندا هەیە، بۆیە ئەگەر ئێوە تەقلیدی شێوازی ئەو دەکەنەوە، نابێت بڵێن من تەقلیدی فلانە کەسی بوونگەرا دەکەمەوە، یان لە فلان رەخنەگری ئەدەبی، ئێوە دەتانەوێ سوود لەم لایەنەی کەسایەتی ئەو وەربگرن، یان ئەگەر هەندێك لە ووتەکانی هەندێك لە بۆچوونەکانتان وەرگرت، ئەو کاتە کەس ناتوانێت ئەنجامگیری ئەوە

بکات کە ئێوە پەیڕەوی فلان شێوازی وێنەکێشانن، لەبەرئەوەی ئەم مرۆڤە شێوازی وێنەکێشانیشی هەیە. بە دەستەواژەیەك ئەگەر چەند چەمکێك لە مرۆڤێکدا بسەلمێن، واتە مرۆڤێك هەم هونەری پیشەی شانۆ بوو، هەم وەرگێڕ بوو و هەمیش لە وەزارەتێکدا بەرپرسیاریەتیەکی هەبوو، ئێستا سێ چەمك لە کەسێکدا هاتوونەتەدی، ئێستا کاتێك من لەو کەسە و یەکێك لە لایەنەکانی دەگوازمەوە، دەبێت بڵێم لەکام لایەن و بواردا دەمەوێت بیگوازمەوە. "سارتەر" فەیلەسوف بوو و خۆی بە فەیلەسوفی بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیزم" ناودەبات. چاکسازێکی کۆمەلایەتی و رۆشنبیریش بوو. ئەگەر من لە بۆچوونە چاکسازییەکانی خۆمدا "سارتەر" پەسەند دەکەم، دەبێت ئەوکاتە بڵێم کە من، "سارتەر"ی چاکساز دەناسم و پەسەند دەکەم، نەك "سارتەر"ی بوونگەرا. گریمانەی ئەوە بکەن ئێوە لای من بیرکاری دەخوێننەوە، بەلام لە هەمان ئەو کاتەی بیرکاریزانم، وێنەکێشیشم، ئایا دەبێت بوترێت ئێوە لە لای من فێرخوازی بیرکاری بوون، یان وێنەکێشان؟ راستە ك من وێنەکێشیشم، بەلام من وێنەکێشانم فێری ئێوە نەکردوە. بۆ بۆچوونی من "د. شەریعەتی" هیچ مایە و بەرهەمێکی بوونگەرایی لە "سارتەر"ەوە بۆ بەرهەمەکانی وەرنەگرتوە و خوێندنەوە و تێگەیشتنێکی لێی هەبووە. ئەو "سارتەر"ەی لە زەینی و مەبەستی "شەریعەتی"یە، "سارتەر"ی چاکسازی کۆمەلایەتییە. لەبەرئەوە من ناتوانم بڵێم لەم روەوە پەیوەندی بە "سارتەر"ەوە هەبووە، پەیوەندییەکی بە بوونگەراییەوە هەبووە. "سارتەر" بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیست"ە، بەلام دەبێت ببینرێت چ شتێکی لە "سارتەر"ەوە وەرگرتوە و بینیوە، ئایا هەبوویەکی بوونگەرایە، یان هەبوویەکی لە رۆشنبیری و چاکسازیدا هەیە؟ بەلام لەبەرئەوەی ئێمە "سارتەر" بە فەیلەسوفێکی بوونگەراش دەزانین، هەر کات "شەریعەتی" قسە لەبارەی "سارتەر"ەوە دەکات، وا بیر دەکەینەوە "شەریعەتی" پەیوەندی بە

بوونگەراییەوە هەبووە، هەرگیز و لە بنەڕەتدا بەمجۆرە نیە، تەنانەت لەو شوێنەی کە قسە لەبارەی "کامۆ"وە دەکات، دەبێت ببینرێت و بزانرێت ئایا لەبارەی بوونگەرایی "کامۆ" قسە دەکات یان لە پەیماندانی ئەهلی قەڵەمی "کامۆ"؟ ئەمانە دوو شتن. "کامۆ" ئایدیای پەیمانی ئەهلی قەڵەم دەخاتەڕوو و "شەریعەتی"یش بەم پەیماندانە قایلە، بەڵام ئەگەر ڕۆژێك کەسێك ئەم پەیماندانەی لە بەرهەمەکانی "شەریعەتی"یدا بینی، نابێت ئەنجامگیری بکات بەوەی "شەریعەتی" شاگردی بوونگەرایی "کامۆ"یە، دەبێت بڵێین شاگردی تیۆریای پەیماندانی کۆمەڵایەتی ئەهلی قەڵەمی "کامۆ"یە. بەڵام لەبەرئەوەی هەم "سارتەر" و هەم "کامۆ"ش لەسەرووی ئەوەی بە فەیلەسوفی بوونگەرا دەژمێردران، چاکسازی کۆمەڵایەتیش بوون، ئەو کاتە هەر کات "شەریعەتی" کەم و زۆر لەم بۆچوونە چاکسازییانە سوودی وەرگرتوە، ئێمە وا بیر دەکەینەوە "شەریعەتی" سوود لە بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیزم"ی وەردەگرێت. ناڵێم "شەریعەتی" خۆی لایەنگری بوونگەرایی نیە، بەڵام لەبەرئەوەی ناوی "سارتەر" یان "کامۆ" دەبات، "سارتەر" و "کامۆ"ی فەیلەسوف لە بۆچوونی "شەریعەتی"یدا نیە، "سارتەر" و "کامۆ"ی چاکسازی کۆمەڵایی لە زەیندایە.

تەنانەت لەو شوێنەی کە قسە لەبارەی "کامۆ"وە دەکات، دەبێت ببینرێت و بزانرێت ئایا لەبارەی بوونگەرایی "کامۆ" قسە دەکات یان لە پەیماندانی ئەهلی قەڵەمی "کامۆ"؟ ئەمانە دوو شتن. "کامۆ" ئایدیای پەیمانی ئەهلی قەڵەم دەخاتەڕوو و "شەریعەتی"یش بەم پەیماندانە قایلە، بەڵام ئەگەر ڕۆژێك کەسێك ئەم پەیماندانەی لە بەرهەمەکانی "شەریعەتی"یدا بینی، نابێت ئەنجامگیری بکات بەوەی "شەریعەتی" شاگردی بوونگەرایی "کامۆ"یە، دەبێت بڵێین شاگردی تیۆریای پەیماندانی کۆمەڵایەتی ئەهلی قەڵەمی "کامۆ"یە. بەڵام لەبەرئەوەی هەم

"سـارتەر" و هـەم "كـامۆ"ش لەسـەرووی ئـەوەی بـە فەیلەسـوفی بوونگـەرا دەژمێردران، چاكسازی كۆمەڵایەتیش بوون، ئەو كاتە هەر كات "شەریعەتی" كـەم و زۆر لـەم بۆچـوونە چاكسـازییانە سـوودی وەرگرتـوە، ئێمـە وا بـیر دەكەینـەوە "شـەریعەتی" سـوود لـە بوونگـەرا "ئەگزیستانسـیالیزم"ی وەردەگرێـت. نـاڵێم "شەریعەتی" خۆی لایەنگری بوونگەرایی نیە، بەڵام لەبەرئەوەی نـاوی "سـارتەر" یـان "كـامۆ" دەبـات، "سـارتەر" و "كـامۆ"ی فەیلەسـوف لـە بۆچـوونی "شەریعەتی"یدا نیە، "سارتەر" و "كامۆ"ی چاكسازی كۆمەڵایی لە زەیندایە.

واتـە چـۆن مـرۆڤ دەتوانێـت "سـارتەر" لەگـەڵ "عـین القـوزاتی هەمـەدانی" یـان "حەللاج لەگەڵ "كـامۆ" كـۆ بكاتـەوە؟ مـن دەڵـێم ئەگـەر لـە بیركردنـەوەی منـدا ئەوەت بینیـت دوو كەسـایەتی بیرمەنـد كـە نـاتوانرێ كۆبكرێنـەوە، لەگـەڵ یەكـدا كۆبوونەوە، بزانە كـە بـە لایـەنی كەمـەوە زانسـتی مـن لـە یـەكێك لـەو كەسـایەتە بیرمەندانە ناتەواوە كە توانیویانە لە مـاڵی خـەیاڵی زەینمـدا لـە تەنیشـت یەكـەوە دابنیشن. گرمانەی ئەوە بكەن مـن ئەگـەر لـە بیركردنەوەمـدا وتم كـە "مـەولانا" و "خیام" لە ماڵی خەیاڵی زەینمـدا لەكـەناری یـەكتردا دانیشـتن، بەلایـەنی كەمـەوە بزانن كە مـن یـەكێك لـەم دوانـە ناناسـم. چونكە ئەگـەر "مـەولانا"ت قبـوڵ بێـت، نـاتوانی "خەیام"یشـت قبـوڵ بێـت، یـان ئەگـەر "خیـام"ت قبـوڵ بێـت، نـاتوانی "مـەولانا"ت قبـوڵ بێـت. بۆچـی؟ نـەك لەبەرئـەوەی خاڵێـك نیـە كـە راسـتی بـە "مەولانا" و "خیام" بێت و قسەیەك بكەن، لـەمجۆرە خاڵانـە بـوونی هەیـە، بـەڵام بناغە و بنەڕەتی فیكر جیایە. ئێوە كە ناتوانن رستەیەك لە قسـەكانی مـن لەگـەڵ رستەیەك لە قسەكانی كەسێكی تر بخەنە تەنیشت یەكـەوە و پاشـان بڵـێن ئەمانـە یەكجۆر بیر دەكەنەوە، دەبێت ببینرێت و بزانرێت ئەم دوو رستە لە چ بناغەیـەك و بەرهەمێكـەوە وەرگـیراون. بنـەڕەت و بناغـەی روانینـی مادديیانـەی "سـیمۆن

دیبڤوار" و "سارتەر" لە کوێ و بناغەی و بنەمای "عین القوزات" و "حەللاج" لە کوێ، وەگەرنا لە قسەی "عیسی" و قسەی "مارکس"یشدا قسەی هاوبشە بوونی هەیە، بەلاّم بە پشت بەستن بە کەسێکی لەمجۆرە ناتوانرێ بوترێ من عیسەوییەکی مارکسیم، یان مارکسیەکی مەسیحیم! مارکسیسزم لە بنەماوە مەسیحیەت نەفی دەکات و مەسیحیەتیش لە بناغەوە مارکسیزم نەفی دەکات. لەبەرئەوە سازگاری دوو رستە لەم بیرمەندە لەگەڵ دوو رستەی بیرمەندێکی تر، جگە لەوەیە کە من دەتوانم مەسیحی مارکسی بم. بە داخەوە ئەم خاڵە لە بەرهەمەکانی "شەریعەتی"یدا دیار و بەرچاوە، سەیری فەهرەستی بەرهەمەکانی "شەریعەتی" بکەن زۆر دوور و درێژترە، ناوی زۆرێك لە کەسایەتیەکان دەهێنێت و چەند بەرامبەری بیرمەندانی دیکەشە، بەلاّم ئەم هەمووە گەڕانەوە و ئەم هەمووە مرۆڤانە لە مەنزومەی فیکری خۆی پیشندان و پیشان نەدان بە بۆچوونی من پیشاندەری ئەوەیە کە نەیتوانیوە جیاوازییەکان ببینێت، ئەویش جیاوازییە بنەڕەتی و بونیادییەکان، "نیچە"ش لەگەڵ "مارکس" و "مەسیح" قسەی هاوبەشی هەیە، بەلاّم "مەسیح" لە کوێ و "نیچە" لە کوێ.

تێبینی: ئەم گفتوگۆیە، گفتوگۆیەکی درێژترە و هێندەمان بە پێویست زانی بۆ زمانی کوردی وەربگێڕین. (و. کوردی)

سەرچاوە: سایتی فەرهەنگی "نیلوفەر"، ئەم گفتوگۆیە لە لایەن "محمد سادقی" لەگەڵ "موستەفا مەلەکیان" ئەنجامدراوە و لە رۆژنامەی "شەرق" ساڵی (١٣٩٢)دا بلاّوبۆتەوە.

# شەریعەتی کێ بوو و چی وت؟

## گفتوگۆ لەگەڵ "د.سروش دەباغ"

لە رۆژانی شەهیدبوونی دکتۆر "عەلی شەریعەتی" گفتوگۆیەکمان لەگەڵ "د. سروش دەباغ" کوڕی رۆشنبیر و بیرمەندی ناوداری ئێرانی "د.عبدالكريم سروش" ئەنجامدا تاکو بۆچوون و روانینی ئەو لەم روەوە بزانین.

پ: رووی جیاواز و سەرنج راکێشی زمانی پەیوەندی و ئەو ئامانجانەی "شەریعەتی" لە مەیدانی بیر و ئەندێشەدا پێیانەوە خەریك بوو، لەگەڵ زمانی پەیوەندی زانایانی تر ئەو قۆناغە لە چیدایە کە رەنگە بتوانرێ بوترێ پایەکانی گوتاری ناو زانکۆ و نەوەی نوێمان، لەگەڵ بوونی ئەو رەخنە گەلەی کە هاو وەچەکانی "شەریعەتی" هەیانە و تەنانەت رۆشنبیری ئایینی ئێمەی لەسەر وەستاوە؟

سروش دەباغ: ئەگەر مەبەست سەرنج راکێشانی گوتار و گوتاری مەرحوم "شەریعەتی" بێت، دەتوانرێ بوترێ کە "دکتۆر شەریعەتی" کەم تا زۆر لەگەڵ زمانی سوننەت ئاشنا بوو، هەرچەندە ئەم ناسینە بە شێوەیەکی زۆر قوڵ نەبوو. برێك تەفسیر، هەندێك کەلام و هەندێکیش فەلسەفەی دەزانی، باوکێکی زانای هەبوو و ژینگەی پەروەردەی ئایینی هۆکاری پێگەیشتن و فراوانبوون و گەشەی ئایینی ئەو بوو. لەسەرووی ئەمەشەوە لەگەڵ شێوازی ژیانی ئایینی ئاشنا بوو.

هەموو ئەمانە بوونە هۆکار بوون لە کرداردا، ئەو ساتەی زاری دەکردەوە و شتێکی دەنووسی، داخوازی و مەبەستی لە سوننەتی ئایینی سەردەمی خۆی کاریگەر بێت. ئەو لە هەمانکاتدا ئاشنایی لەگەڵ ئەدەبیاتی مۆدێرندا هەبوو و قەڵەمەکەی، پەخشان و دەربڕینی، تەژی لە ئامۆژە و ئایدیا مۆدێرنەکان بوو. "دکتۆر شەریعەتی" لە لایەکەوە ئاگاداری "کافکا" بوو و لە لایەکی ترەوە "گلشیری" خوێندبوویەوە و ئاشنایی لەگەڵ "سارتەر" هەبوو، هەڵبەتە لەبارەی قولایی رۆچوونی دکتۆرەوە لەم بیر و هزرانەدا بڕیار نادەم.

بەڵام لەبارەی ئەوەی بۆچی زمانی سەرنج راکێش بوو، دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت مە مەرحوم "شەریعەتی" مەعریفە، ناسین و جیهانبینی خۆی لە قالبی زمانێکی سەرنج راکێشدا رژاندبوو. زمانێکی سەرنج راکێش کە رەنگە کەسانی تر هەیان بێت و وەکو پێویست بە هۆی مەعریفەتیانەوە نەبێت. "شەریعەتی" بینا لەسەر پەروەردەی ئایینی و بە لەبەرچاوگرتنی پێشینەی منداڵی لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ باوکی خۆیدا کە زانایەکی ئایینی بوو و ئاشنایی تارادەیەکی دکتۆر "شەریعەتی" لەگەڵ دونیای مۆدێرنە و .... هتد هەموو ئەمانە لەسەرووی توانای سیحری دەربڕین و سیحری قەڵەمەکەی، کەسایەتیەکی ئاراوتەیی "استپنایی" دوستکرد بوو کە کەمتر لە کەسێکدا هەموو ئەم شتانە کۆ دەبنەوە.

دکتۆر "شەریعەتی" توانایەکی سەرسوڕهێنەری لە قسەکردندا هەبوو. بە مانای ووردی ووشە گوتەبێژ و ووتاربێژ بوو. هاوڕای ئەوەی کە "ئەرستۆ" لەبارەی هونەری گوتاربێژییەوە دەیوت و هونەری جیاوازی لە قسەکردندا لە یەکتر جیاکردبوویەوە و ناسیبوو. یەکێکیان هونەری وتاربێژی، یەکێکی تر هونەری جەدەل و گفتوگۆ بوو لە کۆتاییدا هونەری بەڵگەهێنانەوە. دکتۆر "عەلی

شەریعەتی" زیاد لەوەی قسەی جەدەلی و بەلّگەهێنانەوە بەکاربهێنێت بە چاکی سوودی لە هونەری وتاربێژی وەردەگرت. ئاوازی دەنگی دڵ ئەنگێزی "شەریعەتی" لە وتارەکانیدا و گەنجینەی زاراوە دەولّەمەندەکانی، گوێگری بەرەو لای خۆی رادەکێشا و سیحری لە گوێگر دەکرد.

بۆ وتاربێژێك و رۆشنبیرێك کە دەچێتە ناو مامەلّە و گفتوگۆ لەگەڵ چینی مام ناوەند، بۆ ئەوەی خەلّکی بە گشتیش بتوانن لە قسەکانی بەهرەمەند بن، بوونی هونەری وتاربێژی، گەلێك گرنگە.

هەلّبەتە نابێت دەردمەندی و بوونی ئازاری "شەریعەتی" فەرامۆش بکەین. لەم دەردمەندییەشدا ئەرکی نەدەخستە سەر خۆی و شتی دروستکراو نەبوو. ئەو وێنای راستەقینە و واقیعی خۆی لەبارەی کێشەکان و زیانە فەرهەنگی و کۆمەلّایەتیەکانی ئەو رۆژانەی موسولّمانان و ئێرانیان بێ کەموکورتی دەردەبڕی و لە ژێر کاریگەری گوتاری رەخنەگرانەی مۆدێرنە، وێنای ئەوە بوو کە تووشبوون بە ماشینیزم لە فەرهەنگی ئێمەدا، رۆژئاوازەدەیی و داگیرکاری، خەلّك بە گێلکردن "استحمار" و ستەمکاری کە لە لایەن رۆژئاواییەکانەوە دامێنی ئێمەی پیس کردووە، رێگرە لە پێشکەوتن و گەیشتن بە سەری مەنزلّی مەبەستی ئێمە.

لە لایەکی ترەوە هونەر دەبڕینی ئازار و دەردی هەبوو و بە چەشنێکی زۆر سەیر ئەمەی تێدابوو. وتویانە و هەموومان بیستومانە کە : (قسەیەك لە دلّەوە بێتە دەرەوە، بە دلّیشەوە دەنیشێت.) سەلمێنەری دیاری ئەم قسەیە لە رۆژگاری "شەریعەتی"یشدا بوو.

دکتۆر "شەریعەتی" لەو روەوە لە ماوە و درزی نێوان سوننەت و مۆدێرنە هەنگاوی دەنا و لە رۆشنبیرە کاریگەر و بەناوبانگە ئاینیەکانی پێش شۆرش بوو، ئەو بابەتانەی کە دەیخستنەڕوو، خۆمالّی و ئێستایی بوون. ئەمەش یەکێکە لە

تایبەتمەندییە سەرنج راکێشەکانی دەربڕینی دکتۆر "شەریعەتی". هەڵبەتە خۆماڵیبوونی ئەندێشەکانی دکتۆر "شەریعەتی" لە لایەکی ترەوە رەخنەی رەخنەگرانی بەدواوە بوو.

من لەم دواییانەدا رەخنەم لە یەکێك لە رۆشنبیرانی هاوچەرخ گرتووە کە باوەڕی وایە هەموو ئەو کارانەی لە حەوزەی ئەندێشەدا و لە سەردەمی نوێدا کە رۆشنبیرانی وەکو "شەریعەتی" ئەنجامیان داوە، جۆرێك وەرگێڕان و بیرکردنەوەی ئێمە لە کۆتاییدا جۆرێك وەرگێرانە، نووسیومە و لە وێدا هێناومە یەکێك لەو کارانەی کە رۆشنبیرانی ئایینی وەکو "شەریعەتی" ئەنجامیانداوە، چەمکسازییە.

کارێك کە سەرکەوتنی وەکو "شەریعەتی" لەگەڵدایە. ئەو لەگەڵ هەبوونی ئەوەی کە گونجاوی لە نێوان ئەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدا دەژیا، دۆزینەوەی بابەت گەل لە جیهانی دەوروبەری خۆی و بە دوی بیناکردنی چەمك گەلی نوێ بینا لەسەر ئەو بابەتانەی لە دەوروبەری خۆی و روونکردنەوەی بەوە دەزانی کە رێگاکانی بدۆزێـەوە کە دەتوانێت بۆ واقیع کاریگەر بێت.

لە باسی چەمك سازیدا دکتۆر "شەریعەتی" چەمك گەلی وەك: خودسازی شۆرشی، شیعەگەری عەلەوی، شیعەگەری سەفەوی و گەڕانەوە بۆ خودی دروستکرد. یەکێك لە پێوەرە سەرکەوتوەکانی رۆشنبیر و بیرمەندێك پێوەری توانایەتی لە چەمکسازیدا. چەمکسازی کە پەیوەستە بە پۆلبەندی ئەو بابەتانەی لەگەڵیاندا دەست و پەنجە نەرم دەکەین و تاکو رادەیەکیش ئەو رێگایانەی دەیانگرینەبەر و روونکردنەوەی ئەوەی چ بەرهەم گەل و ئەنجامگەلێك لەسەر کردارەکانمان هەیە.

بە بۆچوونی من نهێنی سەرکەوتنی دکتۆر "شەریعەتی" کۆمەڵە هۆکارێکە کە ئاماژەیان پێکرا. ئەو هونەرمەند بوو لە دیاریکردنی ئازار و رەنج و دەربڕینی

ئازار. دڵسۆزی لە دەربڕینیدا شەپۆل دەدات و لە لایەکی ترەوە بە مەبەست، هونەری وتاربێژی چاك دەزانی و دەستێکی باڵای لە چەمك سازیدا هەبوو.

پ: ئایا ڕێڕەو گۆڕین و بیرکردنەوە لە ژیانی "شەریعەتی"یدا بە شێوەیەکی یەکجۆرە یان قۆناغی جیاوازی لە ڕێڕەوی ئەندێشەی ئەودا دەبینین؟

سروش دەباغ: لە نێوان فەیلەسوفان خۆرئاوادا کە قۆناغی فیکر جیاوازیان هەبووە، بۆ نموونە: دەتوانین ناوی "ڤیتگنشتاین"ی پێشوو و "ڤیتگنشتاین"ی دواتر یان "هایدگەر"ی پێشوو و "هایدگەر"ی دواتر ببەین. بەڵان لەبارەی دکتۆر "شەریعەتی"یەوە، زۆربەی ئەو کارانەی کە "شەریعەتی" ئەنجامی داون، لە دەوری (٤٠) ساڵیدان. بەو مانایەی تەنانەت لاوی و تەمەنی گەنجی ئەو بە کۆتا نەگەیشتوە.

ئەگەر تەمەنی زیاتر بوایە، بێگومان شتانی پوختەتری باس دەکرد و دەردەبڕی و چ بگا بەوەی پێداچوونەوەی بە هەندێك لە ئایدیاکانی خۆی دەکرد.

بە باوەڕی من لە چەند شتانێکدا شاهێدی چوونە ناوەوە و دەستکاریکردن لە مەیدانی ئەندێشەی "شەریعەتی"داین، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بوارێکی بۆ گۆڕانکاری فیکری نەبوو. کات تەنگ، زیندان، کە بەشێك لە ژیانی ئەو لەوێ گوزەرا، بە گوتەی خۆی: (هەزار شەوی تەنیایی) کە لە کتێبی "لەگەڵ گوێگرانی ئاشنا"دا ئاماژەی پێکردوە، هەموو ئەمانە بواری گەشەپێدانی فیکرییان لەو وەرگرتەوە. خودی خۆی ژیانی خۆی بە پێنج ساڵی جیاواز دابەش کردبوو کە هەر یەك لەوانە و لەو ساڵانە بە کارێکەوە خەریك بووە.

"شەریعەتی" باوەڕی وابوو کە لێکۆڵەر نیە و باری ئازاری "ئەبوزەر" و هەموو ستەملێکراوانی جیهان خراوەتە سەر شانی ئەو. جۆری ڕۆمانتیکی بوو، کەسێکی

ئازاراوی کە زیاتر بیرۆکە و بیرکردنەوەکانی روەو جووڵە و بزاوتن بوو جوڵە دروستکردنی بە هۆکاری دەوڵەمەندکردنی کاروبارەکان دەزانی. ئەمە بەو مانایە نیە کە کەڵکەڵەی حەقیقەتی نەبوو، بەڵکو ئەوەی سەنتەر بە بیرکردنەوەکانی دەبەخشی، دروستکردنی بزوتنەوە و شۆڕش بوو.

لە هەمانکاتدا "شەریعەتی" پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە شۆڕش پێش خود ئاگایی، ترسناکە. لە هەمانکاتدا هەنگاوێکە کە بیرۆکەکانی بە شێوەیەکی زۆرینە و فرە پۆلبەندی دەکەین، لە ژێر گوتاری شۆرشدا بەناوی ئایین و بە سوود وەرگرتن لە گەنجینەی وێناکان و شتە سەلمێنراوەکانی ئایین، پۆلبەندی دەکرێت. ئەو ئەنجامەی لێرەدا بەدەست دەهێنرێت بریتیە لەوەی کە ناتوانرێت بە روونی ناوی قۆناغە هزریە جیاوازەکانی ماوەی ژیانی دکتۆر "شەریعەتی" بەرین.

پ: هەر بەو جۆرەی "سروش" دەیوت: لە کۆتاییەکانی تەمەنی دکتۆر "شەریعەتی" لەگەڵ زنجیرەیەك بابەتی رۆحی داخوازی گۆشەگیری و گۆشەگیری رووبەڕووین، ئایا بەرهەمێك لەو قۆناغانەی دکتۆر "شەریعەتی" لەبەردەمماندا هەیە؟

سروش دەباغ: بەڵێ کۆتاییەکانی تەمەنی، کتێب گەلێکی وەکو عیرفان، بەرامبەر، ئازادی و هەندێکی تر لە ئایدیا و بۆچوونەکان لە هەمان ئەو کاتانەدا بڵاودەکاتەوە و رەنگە ئەم حاڵی گۆشەنشینی، پەیوەست بێت بە حاڵی و دۆخی پاش زیندانیکردنی کە کۆچی دکتۆر "شەریعەتی" بە دواوەیە و لە دوای مانگێك پاش کۆچکردن، وەفات دەکات.

پ: "شەریعەتی" ماوەیەکی زۆر لە خانەکانی زیندانی تاکەکەسی تێپەڕاندبوو. لە حاڵ و دۆخی دەروونناسی زیندانیانی تاکەکەسیەکان ئەوە باس دەکرێ کە بە

تێپەڕبوونی کات گۆڕان بەسەر بۆچوونیان دێت، ئایا لە حاڵ و دۆخی ئەویشدا و پاش ئازادبوونی لە زیندان، خاڵێك هەیە لەم خاڵەدا باس بکرێت؟

سروش دەباغ: "عەلی رەهنما" لە کتێبی (موسوڵمانێك لە گەڕان بە دوای یۆتۆپیا)دا هەوڵدەدات تاکو ئەوە پیشان بدات کە شیکارکردنی "شەریعەتی" لە زینداندا گۆڕانی بەسەردا هات. هەڵبەتە دەبێت ئەوەمان لەبەرچاوبێت کە ئەم بۆچوونە دژیشی هەی و خۆشەویستانی "شەریعەتی" ئەم بۆچوونەیان بەدڵ نەبوو، کەسانێك باوەڕیان وایە کە "شەریعەتی" لە زینداندا بەم ئەنجامە گەیشت کە دەتوانرێ بۆ پاراستنی بزوتنەوە و سەرکەوتنی کۆتایی بزوتنەوە لە زینداندا خەریکی رەخنەی مارکسیزم بێت.

پ: هۆکاری جەنجاڵی بیرمەندانی سوننەتی لەمەڕ بیرۆکەکانی دکتۆر "شەریعەتی" و تەنانەت باسی هەڵگەڕانەوە "مرتد"زانینی لەلایەن هەندێك کەسەوە کە لەگەڵ ئەوەشدا تیغی تیژی گومانی بەرەو رۆیشتووە، چیە؟

سروش دەباغ: باسی رەدکردنەوەی دکتۆر شەریعەتی کەم بوو و پاش شۆڕشیش زۆر کەمتر بوویەوە. رەنگە هەندێك وا گومانیان کردبێت کە قسەکانی دکتۆر "شەریعەتی"، دژی ویلایەت، دژی ئیمامەت یان تەنانەت لەو شەتەحیاتانەی لە گفتوگۆکانی تەنیاییدا هەن، پێشێلکەری نبوەت بێت. بە شێوەیەکی گشتی بەمجۆرە سەیری "شەریعەتی" نەکرا و شتێکی سەرتاپایی نەبوو. لە بنەڕەتدا نابێت کەسێك بەمجۆرە شتانە لە رووی مەعریفیەوە نەفی بکرێت و نابێت هیچکات دامێنی ئەم بابەتانە زیاد بکرێت تاکو کۆمەڵگە لە داد و بێداد و گفتوگۆی زانستی بێبەش نەبێت.

پ: لەبارەی گفتوگۆکانی تەنیایی "شەریعەتی"یەوە شتێکتان لەیادە کە حاڵەتی ئەو بە چاکی نومایان بێت؟

سروش دەباغ: بەڵێ، لەبیرمە لە گفتوگۆکانی تەنیاییدا، لە جێگەیەکدا هەندێك لە حاڵ و دۆخی خۆی دەخاتەڕوو و دەستەواژە گەلی وەك بیستنی دەنگی زنگ لە ناو خۆیدا هەست پێدەکات. ئەم دەستەواژەیە یادهێنەرەوەی ئەم بەیتەی "حافیز"ە کە دەڵێت:

کس ندانست که منزلگه مقصود کجاست

انقدر هست که بانگ جرسی می اید

واتە: (کەس نازانێت مەنزڵگەی مەبەست لە کوێوەیە، هێندە هەیە دەنگی زەنگ دێت.

پ: ئایا زانستە مرۆییەکان و زانستە ئیسلامیەکانی "شەریعەتی" هۆکاری دژیەکی لە بیرۆکەکانیدا نابێت؟

سروش دەباغ: شەریعەتی وەکو کەسێکی ئایدۆلۆژی هەوڵیدەدا تاکو سەرچاوە فەرهەنگیەکانمان پاکوخاوێن بکاتەوە و کۆمەڵێك ئامراز لە خەباتێکی شۆرشگێڕیدا بداتە دەست گوێکرانی. بەو مانایەی "شەریعەتی" بە تەواوی ئەکادیمیستێك و لێکۆڵەرێك نەبوو و هەڵبەتە ئەمەش بەو مانایە کە ئاشنایی ئەو لەگەڵ ئامۆژە و فێرکارییە ئایینیەکاندا رەد بکەمەوە.

پ: بە شێوەیەکی گشتی ئایا ئەندێشەی ئایینی "شەریعەتی" بەسەر ئەندێشەی رۆژئاوایی "شەریعەتی"دا زاڵ بوو یان بە پێچەوانەوە یان مام ناوەند بوو؟

سروش دەباغ: لەگەڵ هەردوو ئەم گوتارانە بە شێوەیەکی نەك زۆر قوڵ ئاشنا بوو. نە قوڵبوونەوەی زۆری لە سوننەتی ئیسلامی هەبوو و نە قوڵبوونەوەی قوڵی لە سوننەتی رۆژئاوایی هەبوو. دەتوانرێت حاڵەتی مام ناوەند لە ئەندێشەی "شەریعەتی" بدۆزرێتەوە. برێك کەلامی دەزانی و برێکیش فەلسەفە، کەمێك زیاتر

مێژووی ئیسلامی دەزانی و کەمێك توانای لە تەفسیر و عیرفاندا هەبوو. لە لایەکی ترەوە لەگەڵ کۆمەڵناسی نوێ ئاشناییەکی مام ناوەندی هەبوو. هیچ کام لەم بابەتانە رێگری بیرمەندی کەسێك نابن چونکە هەر بەو جۆرەی وتم، گەنج و گەنجینەی مەعریفی – بوونگەرایی زۆری هەبوو. بەڵام دەبێت بە شایەدی بەرهەمەکانی دەبێت بە شێوەیەکی مام ناوەند هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت.

پ: لە کۆتاییدا هۆکاری نەمری "شەریعەتی" چیە؟

سروش دەباغ: هونەرمەند بوو لە ئامرازی ئازار و دەردا، چەمك سازێکی بە توانا بوو. هەبوونی ژیانێکی کەم تا زۆر سەرنج راکێش و نهێنی ئامێز، قەڵەمی سیحری هەبوو، کاریزمابوونی کەسایەتی، ئەو دڵسۆزییەی تیایدا دەبینرا، لەبەرچاوی ئەوانیتردا حاڵ و دۆخی بوونگەرایی خۆی باس دەکرد کە لە "گفتوگۆکانی تەنیایی" و "کویر"دا هاتووە و کەمتر رۆشنبیری خەریکی ئەمە بووە، هەموو توانا و پێگەی کەسێك زیاد دەکات.

لە "گفتوگۆکانی تەنیایی"دا لەگەڵ مرۆڤێکدا رووبەڕووین کە کەم تا زۆر کەسایەتی خۆی لەبەرامبەر گوێگردا رووت کردۆتەوە و ئەمکارەش هەستی نزیکی بە گوێگر دەبەخشێت و دووری و ماوەکانی لەگەڵدا کەم دەکاتەوە. "شەریعەتی" مرۆڤێکی رەسەن بوو بە هەمان ئەو پێناسەیەی کە بوونگەرایی "ئەگزیستانیسالیزم" لە مرۆڤی رەسەن هەیەتی. پێشبینی دەکەم مانا و نەمر بێت.

* ئەم گفتوگۆیە ساڵی (١٣٨٩) ئەنجامدراوە.
سەرچاوە: ئەنتەرنێت.

# شەریعەتی، بت نیە

## گفتوگۆ لەگەڵ "موجتەبا موتەههەری"

### کوڕی مورتەزا موتەههەری

ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە کە لەگەڵ "موجتەبا موتەههەری"، کوڕی بیرمەندی و کەسایەتی ناوداری ئێرانی "مورتەزا موتەههەری" ئەنجامدراوە، تیایا باس لە پەیوەندی نێوان باوکی و "د. شەریعەتی" دەکات و جیاوازی و ئەو خاڵانەی کە بوونە هۆکاری دوورکەوتنەوەی ئەم دوو بیرمەندە نووسەر و خاوەن بۆچوونە تایبەتانە دەکات، کە بە ئێستاشەوە دەشێ بوترێت هەر یەکەیان بە کاریگەری و جێکەوتی خۆی لەسەر دونیای رۆشنبیری ئێرانی داناوە و هەیە. "و. کوردی"

پ: گرنگترین رەخنەی شەهید "موتەههەری" لەسەر بیروبۆچوونەکانی "دکتۆر شەریعەتی" چی بوو؟

و. ئەگەر بە دیدێکی واقیع بینانە سەیری دکتۆر "شەریعەتی" بکەین، دەبینین ئەو لە حەوزە جیاوازەکانی وەکو: کۆمەڵناسی، مەزهەبی، مێژووی شارستانیەت، مێژووی ئایینەکان، مێژووی ئیسلام و قوتابخانە کۆمەڵایەتی – سیاسیەکان، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زۆر باشی ئەنجام داوە، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە ناکرێت ناوی "ئیسلامناس"ێکی لێ بنێین.

پ: بۆچی؟

و. لەبەرئـەوەی "دایـره المعـارف ئیسـلامی" و بـە شـێوەیەکی گشـتی ئیسـلام، کۆمەڵێك لە زانیاری و زانستی ئیسلامی و مرۆییە. زانیارییـەکانی پێغەمبـەران، بـە زانستی مرۆیـی دەژمێـردرێن و بـە تـەواوی زانسـتی ئیسـلامی نـین و لەبەرئەمـەش رەنگـە هەڵوەشـاندنەوە و جیاکردنـەوەی زانکـۆی ئـەدەبیات و ئیلاهیـات کـارێکی دروست نەبێت. زانستە ئیسلامیەکان و زانستە مرۆییـەکان جیـانین. بـاوکم دیـوت: پسـپۆڕی و بەشـی مـن ئیلاهیـات و زانسـتە مرۆییـەکانن. لـە ئینسـایکلۆپیدیای ئیسلامی یان مرۆییدا، ئیسلام کۆمەڵێك لە زانسـتەکان و لەوانـەش فیقـە، ئوسـوڵ، تەفسـیر، فـەرموودە، کـەلام، فەلسـەفە، عیرفـان، کۆمەڵناسـی، دەروونناسـی و ...هتدە. کەسێك کە دەیەوێت لەم حەوزەیەدا قسە بکات، دەبێت زانیاری تـەواوی لەبارەی ئەم زانستانەوە هەبێت تاکو بتوانێت بابەتەکان شیکار و چارەسەر بکات.

لەبەرئەوە ئیسلامناسی جێگە و پێگەیەکە کە تاکو زانیارییەکان و لق و پۆپـەکانی شـیکار نـەبن و تـاك بەتـەواوی بەسـەر ئـەم زانیاریانـەدا زاڵ نـەبێت، ناتوانێـت ئیسلامناس بێت.

هەموو کەسێك دەتوانێت لە هەندێك لەم بەشانەدا کە کەلامی نوێ و تایبەتمەندی و پسـپۆڕی و زانسـتی خۆیـەتی، ققسـە بکـات، بـەڵام ناتوانێـت لـەبارەی هـەموو زانستەکان و زانیارییەوە مرۆییەکانەوە بۆچوونی خۆی بڵێت. بەڵگە ئەوە نیـە ئـەو کەسەی لەبارەی یەك دوو یان چەند بەشێك لە حەوزەی زانسـتە مرۆییـەکان زاڵ و بە توانا بێت، لەبارەی کۆمەڵە زانیارییـەکیش خـاوەن بۆچـوون بێـت. خـاڵێکی تـر ئەوەیـە کـە لـە زانسـتە ئیسـلامیەکاندا، سـەنتەر و چـەقی بنـەڕەتی فیقـە و فوقەهابوونە و ئەمەش گرنگی تایبەتی هەیە. هەر لەبەرئەمەش ئەو کەسانەی لـەم حەوزانەدا دەخوێنن و پەیوەستیان بە دەروونناسی مێژوو، حیکمـەت یـان عیرفـان

پەیوەستن، هەمیشە سەرەتا ئەدەبیات و فیقه و بنەماکان دەخوێنن و پاشان دەچنە ناو ئەو بەشانەی پسپۆڕی تایبەتی خودی کەسەکەن.

دکتۆر "شەریعەتی" ڕۆشنبیرێکی ئاینیە. کەسێك تاکو ڕادەیەك ئاگاداری زانستە ئیسلامیەکان بوو و پەیوەند و پەیوەستی بەم زانستانەوە هەبوو، لە ڕۆژئاوادا دەرسی خوێندبوو و فەزای خوێندنی لە ڕۆژئاواوە ئیلهامی وەرگرتبوو. ئەدەبیات و پێوەرە نوێکانی ئەمڕۆی دەناسی و مەبەستی بوو ئیسلام لەگەڵ پێوەرە نوێکاندا، بە زمان و ئەدەبیاتی نوێ بە دونیا و وەچەی نوێ بناسێنێت. بە دەستەواژەی ئەمڕۆ بە "نوێگەری" ناو دەبرێت. شەهید "موتەهەری" باوەڕی وابوو دکتۆر "شەریعەتی" ڕۆشنبیرێکی ئاینیە و بە ووردی ئاشنایی لەگەڵ دونیای مۆدێرندا هەیە، دەبێت لەگەڵ زانایەکی گەورەی ئاینی و ڕۆحیدا یان کەسێك لە مەرجەعەکان پەیوەندی بەردەوامی هەبێت. نەك تەنها لەبارەی "شەریعەتی"یەوە، بەڵکو هەر ڕۆشنبیرێکی ئاینی کە دەیەوێت لەم حەوزانەدا بچێتە ناوەوە و کار بکات، دەبێت ئەم پەیوەندیە دروست بکات و بیپارێزێت تاکو دوچاری خلیسکان و هەڵە نەبێت.

پ: کێشەی دکتۆر "شەریعەتی" لە "حوسەینیەی ئیرشاد" و ماجەرای جیاوازییەکانی ئەو سەردەمە هەر لەسەر ئەم بابەتانە بوو؟

و: باوکم لە سەرەتای ئەو کاتەی لە "حوسێنیەی ئیرشاد" بوو، دەیوت دەبێت سوود لە بوونی دکتۆر "شەریعەتی" وەربگیرێت. باوەڕی وابوو ئەم ئبارده نوێیە پیرۆزە، بەڵام دەبێت لە ژێر چاودێری و ڕێنمونی ڕۆحانیەت و ڕۆحدا بێت کە خاوەنی بەرچاو ڕوونی و ڕۆشنبینی ئاینین و دەبێت ئەوەش لە سوودی ئیسلام سوودی لێوەربگیرێت، بەڵام بەو مەرجەی قسە و بەرهەمەکانی لە ژێر چاودێری چاودێرییەکی زانستی – کە خاوەنی خوێندنی قوڵی حەوزەیین – بێت.

کێشـەی رۆشـنبیری ئـایینی، سـەرنجی وورد بـە گـۆڕان لـە قاڵبەگـەرایی ئـایینی و نوێگەراییەتی و زۆرجار کەمتر سەرنج لە کرۆکی ئاین و جێگیربوونی دەدرێت. ئەم نوێگەرایی و گۆڕینی شێوە و قاڵبە، پیرۆزە. بەڵام کێشـەی رۆشـنبیرانی ئـایینی و دکتۆر "شەریعەتی" ئەوە بوو کە بە شێوەیەکی قوڵ ئاشـناییان لەگـەڵ زانیارییـە ئیسلامیەکاندا نەبوو. "شەهید موتەهەری" باوەڕی وابوو ناتوانرێت هەر قسەیەکی نوێ تەرح بکرێت و بخرێتـەڕوو. تـەنها جـوان قسـەکردن بـەس نیـە، قسـەی چـاک هەڵسـەنگێنراو و قسەکردنی پـاك گرنگـە. ئـەم دوانـە دەبێـت لەگـەڵ یـەکتردا کـۆ ببنەوە. دکتۆر "شەریعەتی" زیاد لـەوەی پـاك و وورد قسـە بکـات، جـوان قسـەی دەکرد. شـەهید "موتەهەری" باوەڕی وابوو قسەکردنی جـوان بەخششـێکی مەزنـە بـەو مەرجـەی کـە قسـەکان هەڵبسـەنگێنرێن و قـوڵ و پـاك دەربـبڕدرێنـز جیـایی رۆشنبیری ئایینی لە رۆحی سوننەت، ویلایـەت، عیرفـان، شـەریعەت، رۆحانیـەت و مەرجەع، بۆ کۆمەڵگە کاریگەری زیانبەخشـی لەگەڵدایـە کـە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی هەندێجار رۆشنبیری ئایینی نزیکبوونەوەیەك لە رۆشنبیری رۆژئاوایی پەیدا بکات و دوچاری خلیسکان و زیانی جیدی بێت.

پ: لەم روەوە نموونەیەکتان لەبارەی رەفتاری دکتۆر "شەریعەتی" لەبەردەستە؟ دکتـۆر " شـەریعەتی" چ شـتێکی کـرد کـە بـیر دەکەنـەوە رۆشـنبیری ئـایینی لـە رۆشنبیری رۆژئاواییەوە نزیك بۆتەوە؟

و: بـۆ نموونـە: دکتـۆر "شـەریعەتی" لـە رەخنـەگرتنی لـە رۆحانیـەت، هەنـدێجار رۆحانیەتی نەفی کردوە و بابەتی ئیسلامی لە منهای رۆحانیەتدا دەخستەڕوو. لەم روەوە بۆچوونی باوکم وەکـو بۆچـوونی ئیمـام بـوو و دەیـوت رۆحانیـەت کێشـەی هەیە و دەبێت رەخنەی لێ بگیرێت، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەرێزترین و پـاکترین دامـەزراوە، رۆحانیەتـە. هـیچ شـتێك ناتوانێـت جێگـەی رۆحانیـەت بگرێتـەوە و

نەدەبوو دکتۆر "شەریعەتی" ڕۆحانیەتی نەفی بکردایە. ڕەخنەی ڕۆحانیەت دەبێت بۆ چاکسازی و پاراستن و مانەوەی ڕۆحانیەت بێت، نەك نەفیکردنی.

پ: چ کەسانێك دەتوانن ڕەخنە لە ڕۆحانیەت بگرن؟

و.باشترین کەسانێك کە دەتوانن ئەم دۆخە بگۆڕن، ڕۆحانیەتە. کەسێك خۆی پەرێشانی حەوزە و ڕۆحانیەت بێت و خۆی بەشێك بێت لەم توێژە. دەبێت خودی ڕۆحانیەت ڕەخنە لە حەوزە بگرێت. کەسێك ناتوانێت لە دەرەوە ئەمکارە بکات و ڕەفتار و گوفتاری شەهید "موتەههەری" و "بەهەشتی" و ئەو وتارانەی لەم ڕووەوە نوسیان، ئەوە پیشاندەدات ئەوان باوەڕیان وابوو کەسانی زانکۆیی ناتوانن ڕەخنە لە ڕۆحانیەت بگرن، ئەمکارە پەیوەستە بە خودی ئەم دامەزراوە پیرۆزە و زانایانی ئایینی و مەرجەعەکانەوە. باوکیشم ڕەخنەی لەم حەوزەیە دەگرت. دەیوت دەبێت لە باس و وانەکانی حەوزەدا، داخوازی نوێ و بابەتی ڕۆژانە بێنە ناو حەوزەوە. دەبێت حەوزە بگۆڕدرێت.

شەهید "موتەههەری" باوەڕی وابوو کاری "شەریعەتی" وەکو ڕۆژهەڵاتناسەکانی وەکو (ڤیکتۆر هۆگۆ، گۆتە) و شاعیرانی فەرەنسی و ئەڵمانیە کە بە هەموو ئەو پەیوەندییەیان بە ڕۆژهەڵاتەوە، نایناسن. بەڵام ڕۆژهەڵاتناسی "ئیقباڵی لاهوری"، ڕۆژهەڵاتناسیەکی واقیعیە، چونکە تیایدا ژیاوە. ئیسلام بابەتی ناسین و مەعریفەتە. ئەم مەعریفەتە سەرچاوەی مەعریفی دەوێت، "سوژە" نیە. دکتۆر "شەریعەتی" وەکو کاری "هۆگۆ" و "گۆتە"، ئیسلامی کردە بابەتی شیعر و دەستکردن بە سرود و وتنی ئیسلام.

هەندێجار بە هۆی هەندێك لە هەڵەکان، ئێمە تاکەکان نەفی دەکەین. هەندێ کەس لە جیاتی ڕەخنە لە قسە، دەست دەکەن بە ڕەخنەگرتن لە قسەکەر. کاری دروست و عەقڵانی ئەوەیە کە ئێمە دەست بکەین بە ڕەخنەی دروست و ڕاستی

دکتۆر "شەریعەتی"، نەك نەفیکردنی. مەرحوم "جەعفەری" بە کوڕەکەی وت تاکو "حەج"ی "شەریعەتی" نەخوێنیتەوە نەچیت بۆ "حەج". دوو جۆر روانینی هەڵە لەبارەی "شەریعەتی"یەوە بوونیان هەیە. هەندێك بە ئەفسانەی دەزانن و بێ گوناه و هەرچی نووسیوە، وەحی ئاسمانییە. هەندێکیش دەڵێن. ئەو کەسێکی بێباوەڕ "ملحد" و بێ دینە کە مەبەستی خیانەت بووە.

پ: پەیوەندی نێوان شەهید "موتەههەری" و دکتۆر "شەریعەتی" چییە؟ لەسەرەتاوە چ پەیوەندییەك لە نێوان ئەمانەدا بوونی هەیە تاکو جیا ببنەوە.

و. دکتۆر "شەریعەتی" بە بانگهێشتی شەهید "موتەههەری" چوە ناو "حسێنیەی ئیرشاد"ەوە. باوکم باوەڕی وابوو کەسێکە لە رۆژئاوادا تەواوی کردوە و باوەڕدارە و پەیوەستە بە زانیارییە ئیسلامیەکانەوە، دەبێت سوود لە زمانی نوێ و جوانیەکەی وەربگیرێت. لەبەرئەوە بوونی دکتۆر "شەریعەتی" بە شتێکی دەوڵەمەند و گەنجینە بژمێرین. بەڵام دواتر کە بابەتی هاتنە ناوەوەی ئاغای "میناچی" و ئەوانیتر خرایەڕوو، بابەتەکان شێوەیەکی تریان وەرگرت. دکتۆر "شەریعەتی" دەروونێکی پاکی هەبوو، هەر لەبەرئەمەش رێگەی بە باوکمدا دەست بۆ نووسینەکانی ببات.

پ: مامەڵەی شەهید "موتەههەری" لەگەڵ دکتۆر "شەریعەتی" چۆن بوو؟

مامەڵەی باوکم لەگەڵ "شەریعەتی" لەگەڵ لێبوردن و ئاسانکاریدا بوو. لێبوردن و ئاسانکارییەك کە پێوەری هەبوو و نەدەچوە ناو بنەما و بنەڕەتی ئایینەوە. بۆ نموونە: باوکم دەیوت: توانا و ئامادەگی ئایینی هەمووان وەکو یەك نیە، هەموو خەڵکی ناتوانن کراوە بن، بەڵام هەموو کەسێك هێندەی ئایینداری خۆی رێزدارە. ئەگەر لێبوردن و ئاسانکاری بەم مانایە بێت، قسەیەکی تەواو و راستە. یان دەیوت: دەبیت ئازادی بیرکردنەوەمان هەبێت، هەندێك لە تاکەکان ئەندێشەی

هەڵەیان هەیە، بەڵام ئێمە دەبێت بەرگە بگرین، نەك لەرووی لاوازییەوە، بەڵکو بەهۆی دڵ فراوانی و گەورەییەوە، بەهایان پێ بدەین. وەکو ئەهلی کتێبە هەندێجار ئەم سنورانە تێکەڵ دەبن و دەبێت تا رادەیەك و برێك لێبوردن و قبوڵکردن لەیەك بوونی دیاری بکرێت.

پ: شەهید "موتەههەری" رووەو دکتۆر "شەریعەتی" لایەنگری بۆ دروست بوو، یان دکتۆر "شەریعەتی" بەرەو ئەوان رۆیشت؟

و: سەرەتا بۆ ئەوەی کە "شەریعەتی" بە سوودی ئیسلام سوودی لێوەربگیرێت، شەهید "موتەههەری" بەدوای "شەریعەتی"دا رۆیشت، بەڵام دواتر جیاوازییەکان دروست بوون و "میناچی" نەیهێشت پەیوەندی چاك دروست بکەن، شەهید "موتەههەری" لەم رووداوە جیابوویەوە و ووتی: ئەگەر "شەریعەتی" بیەوێت بە بێ بۆچوونی ئێمە و رۆحانیەت درێژە پێ بدات، لەگەڵیدا هاوڕان نین و رێگەمان جیا دەکەینەوە. باوکم پێشبینی دەکرد کە دکتۆر "شەریعەتی" بە بێ رێنمونی رۆحانیەت و تاکی ئایینناس لە زانستە ئیسلامیەکاندا، دوچاری هەڵخلیسان دەبێت. گەورەترین هەڵخلیسکانی دکتۆر "شەریعەتی"یش تێزی "ئیسلام کۆتایی ئاخوند"بوو. بۆ ئەم قسانە ئیمام هێڵی بەژێر ووشەی "مەرحوم"دا هێنا و لە بەیاننامەی ئەنجومەنی ئیسلامی ئەمریکا وتیان "لەناوچوون"ی دکتۆر "شەریعەتی" بەسە.

ئەم رووداوە ئەوە پیشاندەدات ئیمام لە ناوەوە زۆر لە "شەریعەتی" نارەحەتە. ئیمام بۆچوونی توندیان دەربڕی و وتیان ئەو کەسانەی هێرشیان کردە "شێخ بەهایی" و " عەللامە مەجلیسی"، تێناگەن! دکتۆر "شەریعەتی" دەیوت ئێمە پێویستمان بە "ئەبو عەلی" نیە، پێویستمان بە "ئەبوزەر"ە، بەڵام شەهید "موتەههەری" دەڵێت، نەخێر، جەنابی رۆشنبیر! ئێمە هەم پێویستمان بە

"ئەبوزەر"ە و هەمیش پێویستمان بە "ئەبو عەلی سینا". روانینی ئەو زیاتر لە دیدی کۆمەڵناسیەوە زاڵتر بوو. هەڵەی ئەو ئەوە بوو کە بابەتەکانی لە رووی مێژوو و کۆمەڵناسیەوە شیکار و چارەسەر دەکرد و شۆرشی لە رووی کۆمەڵایەتیەوە شیکار دەکرد و لە لایەنەکانی تر بێئاگا بوو، لەگەڵ پەیوەندییەکی توندی بە زانستە ئیسلامیەکان هەبوو، دەیوست خزمەت بکات، دڵسۆزی ئایین بوو و باوکێکی مەزنی بەرێزی هەبوو، بەڵام بەداخەوە نەیتوانی لەم بازنەیە بە چاکی سوود وەربگرێت.

دکتۆر "شەریعەتی" لە جیاتی رەخنە لە رۆحانیەت، رۆحانیەتی نەفی دەکرد کە هەڵبەتە ئەو دەروونێکی پاکی هەبوو، هەر لەبەرئەمەش بەرهەمەکانی بە باوکم سپاردن بۆ پێداچوونەوە و رەخنەگرتن. شەهید "موتەههەری" دەیوت ئەگەر "شەریعەتی" زیاتر زیندوو بمایەتەوە، رەنگە زیانی زۆرتری هەبوایە. لە هەندێ رووەوە ئەوە حیکمەتی خودایە کە ئەوی بۆ لای خۆی بردەوە و لە لوتفی ئیلاهی بوو. ئەگەر بمایە، کەلینی نێوان رۆحانیەت و چینی رۆشنبیر زیاتر دەبوو. ژمارەیەك شەیتان، لەم نێوەندەدا کێشەیان دروست دەکرد، نەخۆشی رۆحی بوون و سوودیان لەم کەلێن و جیاییە وەردەگرت و ئەم بابەتە دەروونیەش لە جیایی خستنە ناو زانست و ئایین — ئایین و عەقڵ، ئایین و سەرکەوتن، کاریگەری هەیە.

سەرچاوە: ئەنتەرنێت، سایتی "تابناك"، ساڵی (١٣٨٩) بلاوبۆتەوە.

## لە نێوانە دوالیزمەکانی تراژیدیا:

## شەریعەتی، نموونە یان ڕێگە

**سەوسەن شەریعەتی**

(ئەوەی رۆژئاوای مەسیحی گەڕایەوە بۆ یۆنان و رۆمی کۆن و ئەمانەی هەڵبژارد، نە نموونە بوو و نە دەستوری کار، تەنها رێگە و شێواز بوو)، "برودل"

"شەریعەتی" بە درێژایی ئەم ساڵانە بە پارچە نووسینەکانیدا دەیناسین، لەگەڵ پارچە نووسینەکان و چەند کلیلە زاراوەیەك وەکو: ئایدۆلۆژیا، ئامانجگەرایی، رادیکالیزم و ...هتد و لە ستایش یان زەمکردنی ئەودا گەر شتێك وتراوە و بیستراوە لە دەوری هەر ئەم سێ، شتەدا بووە. ئەو سێ شتەی کە بە زۆری لە ژێر سیاسەت و لقەکانیدا و هەروەها مەعریفەت و لق و پۆپەکانی پێناسە کراون. لەگەڵ ئەمەشدا بوونی ناسینی گوێگی گۆڕاوی سێ دەیەی کۆتایی "شەریعەتی"، ناسینی رێڕەوێکی بەستراو بووە، کە لە ماوەی ئەم سێ ساڵەدا وورد وورده کراوەتەوە. بەرهەمەکانی "شەریعەتی" وورده وورده لەماوەی ساڵەکاندا چاپ بوون. کۆتا بەرهەمیشی بە چاپکردنی کتێبێکی نوێ پشت گوێ خراوە و چوەتە ناو پێچ و بەربەستێکی دیکە. مەگەر راز و نهێنی بیرمەندێك، هەر ئاوا و بەو شێوەیە دەبێ لێی بێئاگا بین؟

ئەندێشەکانی "شەریعەتی" یەکجۆر بن یان دژیەك، دەبێت لە دوو توێی و لە ناو ژیانیدا بناسرێن. ئەو لەو بیرمەندە دەگمەنانەیە کە ژیانی هاوشێوەی ئەندێشەکانیەتی و بە پێچەوانەشەوە. ئەو دەستەواژەی کە خودی خۆی لە بارەی "ئیقبال"ەوە هەیەتی لەبارەی خۆشیەوە هەر راستە. ژیانی هەڵگری پەیامەکەی بوو. "شەریعەتی"یش جۆرێك بیرکردنەوەیە، هەروەها جۆرێك ژیان و هەر یەك لەمانەش بەرهەمی پێکداادان و رووبەڕووبوونەوە و بەرکەوتن و هاونشینی دۆخە هاوسەنگ و بەرامبەرەکانە. بۆ ناسینی ژیانی ئەو و لە ئەنجامدا تێگەیشتن لە بیرۆکە و ئەندێشەکانی بە پێچەوانەی هەمیشە باشتر وایە ئەمجارە لە رێگەیەکی ترەوە بچینە ژوورەوە رێگەیەکی کە تاکگەرایی هەیە و دیاریکردن و سنوردارکردن و لێکچوونی لەگەڵ ئەوانیتردا کەم نابێتەوە. مەبەست لە ئەدەبیاتی "شەریعەتی"یە و بە دەستەواژەی خودی خۆی بیابان"کویریات". نەك بەو مەبەستەی کە لە بیابان"کویر"دا بیپارێزین، تەنها لەبەرئەوەی پاش تێپەڕبوونی ئەوە، ئاوایی و ئاوەدانیەکانی ئەو باشتر بناسین. مەبەست لە ئەدەبیات، ئەو حەرەمەیە کە "شەریعەتی" لەگەڵ یەکەم کەسی تاکدا قسە دەکات، شەفافە و دەستەکانی کراوە. لە پشت هیچی "مـن" کۆمەڵێك پەنهان و شاراوە نیە، بەرپرسیاریەتی دژیەکیەکانی دەخاتە ئەستۆی خۆی و تەنانەت "شانازی" یان پێدەکات و بەدوی ناسینی و دروستکردنی هیچ نموونەیەك نیە. جێگەیەك کە نووسەر بە دەستەواژەی "ئورهان پاموك": (بەسەر زامەکانی دەروونیدا دەمێنێتەوە، ئاشکرایان دەکات، پشتی بە ئەوانیتر بەستوە و خۆی دەخاتە ناویانەوە. "نووسەر کە ئەمکارەی لەگەڵ زامەکانی ناخ و دەروونی خۆیدا دەست پێکردووە، زانیبێتی یان نا بە قوڵی پشت بە مرۆڤ بەستووە. ئەدەبیاتی راستەقینە پشت ئەستوورە بە پشت بەستنی خۆبینانە، پشت بەستنێك لەم بارەدا مرۆڤەکان هاوشێوەی یەکترن. (١) تەنها رێگەیەك بۆ نوێکردنەوەی بۆچوون

و روانین لە تێگەیشتن لەو زاراوە کلیلیانەی کە لەسەرەوە ئاماژەیان پێکرا تێپەڕبوونە لەم ڕێڕەوە، لە نیشتنەوە"هبوگ"، لە بیابان "کویر"دا. "میلان کۆندێرا" لە کتێبی "هونەری ڕۆمان"دا دەنووسێت: (هەر مرۆڤێك کۆدێکی بوونگەرایی "ئەگزیستانسیالیست"ی هەیە.)، گەر ئەم گوتەیە راست بێت لەبارەی "شەریعەتی"یەوە دەتوانرێت بوترێت کە کۆدی بوونگەرایی "ئەگزیستانسیالیست"ی ژیانی ئەو، سەراسیمەییە. (ئاوارەیی و سەراسیمەیی سیفەتێك نیە لە مندا، خودی منە. بنەڕەتیترین پانتایی و لایەنی رۆحی من، رۆحی "من"ە. (نیشتنەوە، لا٤٥). هەر ئەم ناوەرۆك و مانایە لە "ئێمە و ئیقبال"دا دووبارە بۆتەوە. (مرۆڤ، سەراسیمەیی نێوان رۆژئاواو و رۆژهەلاتی خۆیەتی.) و جارێکی تر هەر ئەم ناوەڕۆکە لە کتێبی "گەرانەوە بۆ خود"دا دەخوێنینەوە، رۆشنبیری ئاوارە. ئەو رستانەی هاتن، پەیوەستن بە سێ قۆناغی جیاوازی ئەو و لە هەمانکاتدا دووبارە. یەکەمین قۆناغ بۆ ساڵەکانی (٤٦–٤٧)دەگەرێتەوە. دووەم بۆ ساڵەکانی (٥٠–٥١) و کۆتاییش بۆ ساڵەکانی (٥٤–٥٥) و گرگتر لە هەموو ئەمانەش لەو کتێبانەی کە هەموویان لە رەگەزی "کویریات"نین. بۆیە دەتوانرێت بانگەشەی ئەوە بکرێت کە ئەم سیفەتە نەمرە، ژیانی "شەریعەتی"یە و بەرپرسیاریەتیشی لە حەوزەی بیرکردنەوەدا دەخاتە ئەستۆی خۆی.

ئەم سەراسیمەبوونە بەرهەمی وەستانە لەسەر سەری دوو ڕێگایەك، دوو ڕێگایەك کە روخساری دیاری مرۆڤی ئەمڕۆیە و لە هەمانکاتدا حاڵی فەرهەنگ، مێژوو، جوگرافیا، و کۆمەڵگەی ئێمەیە. "شەریعەتی" ئەم دوالیزمانە کە دەردی تووشبووی سەردەمی ئێمەشن، بە شێوەیەکی پێست و گۆشت و ئێسك دەژی، رەنج و ئازاری لێ دەبات و هەموو هەوڵ و کۆششی پەیداکردنی رێگەیەکە بۆ تەواوبوون، (ئەگەر ئازار، بوون یان نەبوون بووایە کە ئاسان بوو و چ ئاسان

دەرمان دەبوو. بەڵام کامیان بوون، گومان، ئازاراوی و ترسناکە) (هبوط، لاپەڕە ٥٢). هەر ئەم پرسیارە لە کامیان بوون و کامیان لە هەموو بوار و گۆڕەپانەکانی ژیانکردن و فیکردا، دوای دەخات. پرسیارگەلێك کە ساڵەهایە هەمووان دوا دەخات و ئەمڕۆ هەمووان لەبارەی ئاشتی یان داخوازی ئەم ئاشتیە، قسەی لەبارەوە دەکەن. دوالیزمەگەلی هەروەك ئایین و دونیا، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، عەقڵ و دڵ، سوننەت و مۆدێرنە و ...هتد قسەکردن لە پێویستی ئاشتی ئیدی بەکەڵك نایەت، واقیعیەت دەیەوێت کاری خۆی بکات. قسەکردن لەبارەی چۆنیەتی ئەم ئاشتیەوەیە کە دەتوانێت ئەمە لە ئەو، شتە دیالیکتیەکان لە شتە میکانیکی و مۆنتاژییەکان لێك جیابکاتەوە و مۆدێلی هەڵگەڕاوە و قاڵبێکی شایان دیاری بکات و بەڵام سەراسیمەبوونەکانی "شەریعەتی" کامانەن و شێواز و ڕێگەی "شەریعەتی" بۆ هاتنەوەی لەگەل ئەمانەدا لە چ ڕەگەز جۆرێکە؟

## دژیەکی نێوان "دۆخی مرۆیی" و "پێگەی کۆمەڵایەتی"

"شەریعەتی" لە نامەیەکدا بۆ کوڕەکەی لە ساڵی (١٣٥٥)دا دەنووسێت: (ئازاری گەورە من ئەوە بووە کە هەمیشە لە نێوان "دۆخی مرۆیی" و "پێگەی کۆمەڵایەتی"م دژیەکیەك بوونی هەبووە. ئەگەر بە خۆم بوایە و فەلسەفە و ئەدەبیاتم دەخوێند، بەڵام بە دەست خۆم نەبوو و هەر لەم ڕووەوە ڕۆیشتم و کۆمەڵناسیم خوێند.) "شەریعەتی" ئامادەی هەڵبژاردن نیە و لە هەمانکاتدا ناچارە هەڵبژێرێت و هەڵبژاردن ئەنجام بدات، لە نێوان خۆی و ئەویتردا، لە نێوان کەڵکەڵە تاکەکەسیەکان و پێویستیە کۆمەڵایەتیەکان. ڕێگەیەك کە بۆ ژیانی ئەم دژیەکیە دەدۆزێتەوە، هەڵوەشاندنەوەی ژیانی خۆی بۆ سێ بوار و مەیدانی "کویریات، اجتماعیات و ئیسلامیات)ە تاکو بتوانێت لە ڕێگەی پێکهاتە و

دروستکردنی بوارە و مەیدانە سەربەخۆکان، ئەگەرچی تێکەڵ بەیەك بوون، هەم مەجازێکە کە "شەریعەتی" بۆ خۆی پێناسەی دەکات و دروستی دەکات تاکو لەوێدا بتوانێت راهێنان لەسەر "خود"بوون بکات و راستەوخۆ بەفەرامۆش نەسپێردرێت.

## ناهاوکاتی نێوان کاتی رۆژمێری و کاتی مێژوویی

(لە نێوان دوو قۆناغدا وەستاوم و هەموو رەنج و ئازارە دژیەکەکانی ئەم قۆناغە لە خۆمدا دەدۆزمەوە.)(ئێمە و ئیقباڵ، ل٢٨٧). مرۆڤێك کە ئازار و رەنجەکانی سەدەی بیستەمی هەیە، بەڵام پەیوەستە بە چوار سەدە پێش ئێستاوە، کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست. بۆیە چی بکات؟ بانگەشە بکات بۆ مەزهەب و مانا و یان بانگەشەی پچڕان و سەربەخۆیی لەبەرامبەر ئۆتوریتە قودسی و سێبەرەکانی لەسەر زەویدا؟ ئەو رێگەیەی کە پەیدای دەکات هاوشێوەی رێگە چارەی یەکەمە، چاکسازی ئایینی هەروەك پرۆژەی کۆمەڵایەتی لە لایەکەوە (پرۆتستانتیزمی ئیسلامی، پۆلێنکردنی سەرچاوە فەرهەنگیەکان، رەخنەی دامەزراوەی فەرمی مەزهەب و ...هتد) و لە لایەکی ترەوە بانگەشە بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندی نوێ لەگەڵ ئەمری پیرۆز. پەیوەندییەکی دۆزەرەوەی تاکگەرایی، بێوەاسیتە و ئازاد. مرۆڤێك نەك لە بەرامبەر خودادا، بەڵکو هاودەستیەتی. خودایەك نەك لەبەرامبەر مرۆڤدا، بەڵکو نزیکیەتی.

## دوالیزمەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا:

(مرۆڤ سەراسیمەیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای خودی خۆیەتی.)(ئێمە و ئیقباڵ)

"شـەریعەتی"، رۆژهـەلآت - و رۆژئـاوا بـە دوو لایـەنگری بـوون "وجـود"ی، کێشمەکێشی نـاوەکی و دەروونـی دەبینێـت، نـەك بـە تـەواوی شـتی جـوگرافی. رۆژهـەلآت چـیە، رۆژئـاوا کامەیـە؟ ئایـا رۆژئـاوا پچـڕان، هەڵوەشـان و گومانـە و رۆژهەلآت پەیوەستبوون؟ رۆژهەلآت پەیمان و بەڵێنە لەگـەڵ "بـە"، هاودەسـتی و هاونەوایی "بە". رۆژئاوا پچڕانە "لە"؟ دوو هەرێمی جوگرافی لەگەڵ سنوورەکانی دیـاریکراوی جارێـك بـۆ هەمیشـە یـان دوو پرۆژەیـە، هـەردووکیان ناتـەواو و هـەر یەکێکیان لە حەسرەتی ئەویتریان.

"شـەریعەتی" لـە تایبەتمەندییـەکانی سـەدە نوێکانـدا و هـەروەها مێـژووی شارستانیەت ئەوە پیشاندەدات کە فەرهەنگ یـان شارسـتانیەتی رۆژئـاوایی پـێش هـەر شـتێك بەرهـەمی چـەند رێککـەوتنێك و چـەند رووبەڕووبوونەوەیەکـە ، درێژەپێـدانێك کـە لـە تێکەڵبوونێکـەوە دروسـت بـووە. زنجیرەیـەك لـە پچـڕان و بەردەوامبوون، یۆنانی بوونی رۆمیەکان (کەشفکردنی دەوڵـەت — شـار و زانسـت)، رۆمـی بـوونی نەتـەوە نـا رۆمیـەکان (کەشـفکردنی مـافی تایبـەتی، مرۆڤگـەرایی)، مەسیحی بوونی ئەورووپیە کافرەکان (کەشفکردنی دینـامیکی ئایدیای پێشـکەوتوو لە مێژوودا، ئینکاریکردنی پێکهاتـەی مـرۆڤ)، هاونشـینی ئـەفلاتۆن — شیشـرۆن و مەسـیح (کەشـفکردنی دووبـارەی بەرهەمـەکانی یۆنـان و رۆم و جـارێکی تـر گێڕانەوەی رێز بۆ عەقڵ و مرۆڤ) و دواجاریش (کۆتایی؟)، دەرکەوتنی مۆدێرنە کـە بەرهەم و پچڕانیشە (لـۆژیکی ئـازادی و بنـەمای چاودێری) لەگـەڵ ئـەم پرسـیارە ئازاراویە کە دۆخی مۆدێرنە گەیشتۆتە کۆتایی و یان پرۆژەیەکە ناتەواو؟ جیهانێك کـە لـە هـەموو بارێکدا رووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ تـوخمی بێگانـە، وەچـەی خـۆی هەڵبژاردوە.

بەڵام ڕۆژهەڵات، فەرهەنگ یان شارستانیەت چیە؟ برهمنە یان "اللە"؟ کنفۆشیوسە یان موحەممەد"ص"؟ تبت یان مەککە؟ سوشیانت یان مەهدی؟ سەلمان یان ئەبوزەر؟ بوعەلی یان غەزالی؟ فەلسەفە یان ئیلاهیات؟ عەقڵە یان شەرع؟ ئیبن روشدە یان ...

"شەریعەتی" لە نێوان ئەم دوالیزمانەدا دەیەوێت بزانێت تەنانەت ئەگەر ڕۆژهەڵات ئەوە بێت و ڕۆژئاوا ئەمە، ئێمە لە کوێداین، چین؟ ڕۆژئاوایی یان ڕۆژهەڵاتی؟ دەمانەوێت چی بین؟ نەڵێین ئێمە، بڵێین من؟ کام ڕۆژئاوایی و کام ڕۆژهەڵاتی؟ لێرەشدا ئەو واز لە هەڵبژاردن دەهێنێت و بەدوای ئاشتی نامومکینیشدا ناگەڕێت. هەر لەم روەوەیە لە کتێبی "ئێمە و ئیقباڵ"دا ئەوە پیشاندەدات کە بۆ دۆزینەوەی وەڵام دەبێت لەسەرەتاوە بەڵای گەورەی ئەم دوو شوێن و پلەیە بناسین، ڕۆژئاوازەدەیی لە لایەکەوە و ڕۆژهەڵات زەدەیی لەلایەکی ترەوە. ئەو هەردووکیان "زەدەیی" دەزانێت و ناو دەبات و "زەدەیی" بە جۆرێك نەخۆشی دەزانێت و لە هەموو شوێنێکدا بە دوای ناسینی نیشانەکانی ئەم نەخۆشیەدا دەگەڕێت. هەر جۆرە وەڵامێك پاش ناسینی ئەم دوو زیانە دەکرێت.

ئەو ئەوە پیشاندەدات کە ئەم "من"ە بۆ بوون، لەسەر لێوی چەکدا دەجولێت و هەموو هەوڵی ئەوەیە کە بە یارمەتی ئەم ئاگاییە هاوسەنگ و لێکچوانە و هەندێجار ناپەیوەستانە لەگەڵ یەکتردا هاوسەنگی خۆی بپارێزێت. "شەریعەتی" ئەم هەڵوەشاندنەوەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا قبوڵ دەکات، بەڵام باوەڕی وایە کە دەتوانین هەردوو بلۆکەکە وەکو بلۆك ئاسا وەرنەگرین. نە ڕۆژئاوا، ئەزموونێکی یەکپارچەیە، بۆ نموونە پچڕان لە مەزهەب و نەفیکردنی مانا و نە ڕۆژهەڵات بە تەواوی پێچەوانەوەی ئەوە. ڕۆژئاوا ئەزموونی مەسیحیەتە و یۆنان و ڕۆم و مۆدێرنەیە، پێکەوە و ڕۆژهەڵات واتە سوننەتی عەقڵانی، فەلسەفەی ئیسلامی،

دروستکەری شارستانیەتی شاری و هەڵبەتە عرفانیش. ئەو هەوڵدەدات لە رێگەی نەفیکردنی ئەم روانینە بلۆك ئاساوە توانای گفتوگۆ و هەڵبژاردن فەراهەم بکات و وەکو دوو پێکهاتە سەیری ئەم دوو شارستانیەتە نەکات.

ئەوەی "شەریعەتی" ناوی سەراسیمەیی رۆژهەلات و رۆژئاوای لێ دەنێت، شوێنگەیەکی دوو پارچەییە کە مرۆڤی ئەمرۆی سنووردارکردوە، دەستی دەستیکردنی لە لایەن زنجیرەیەك ئاگایی گەلێکەوە کە پێکەوەش دەژین و یەکتر پیس دەکەن، ئاگایی لەمەڕ ئازادی خود و پەیدابوونی گومانی لێی. ئاگایی بە مەبەستی دەرچوون لە ژێر سەقفی بیرەوەری و دوێنێ، لە هەمانکاتدا مانەوە و هێشتنەوەی سوننەت و بیرەوەری لە فەرهەنگی ئێمەدا. ئاگاییی گەلێك کە یەك لە دوای یەك بەدوای مندا نایەن، بەڵکو بازیەك دروست دەکەن و من لە خۆمدا گرفتار دەکەن.

## دوالیزمەیی سوننەت و مۆدێرنە:

رێگە و شێوازی "شەریعەتی"یش لێرەدا روونە. دژیەکی ئەم دوو دۆخە قبوڵ دەکات، هەستی پێی دەکات و دەستیان لێدەدات و رەنج و ئازاری لێ دەبات. لەگەڵ بوونی ئەمەشدا ئامادەی مۆنتاژ نیە، لە لەخۆبێگانەبوون "ئالیناسیۆن" دەترسێت، لە رووتبوونەوەی شوناس دەترسێت و لە هەڵگەرانەوە. بەڵام بە هەمان ئەندازەش لە قاڵبی بوونیش بێزارە. ئەو بۆ ئەوەی بتوانێت پەیوەندییەکی نوێ لە نێوان ئەم دوو دوالیزمەیەدا بە رووکەش دژیەك بیر لێ بکاتەوە، بە دوی ئاشتی پڕ لە ئاسانکارییەوە نیە. ئەو دەیەوێت "خۆی"ی بێت و هاوشێوەی خۆی بمێنێتەوە، بەڵام دەزانێت کە بۆ ناسینی خۆی، ئیدی شتێکی پێویستە. (ناسینی

خۆی بە مانای سنووردار و زیندانیبوونی لە قاڵبەکانی خوددا نیە، بەڵکو کەسێك دەتوانێت خود بناسێت کە لە هەمان کاتدا بتوانێت ئەویتر بناسێت... ئەمەیە کە هەموو هەوڵ کۆششە و ئامانجەکانمان لە هەمانکاتدا کە دۆزینەوەی کەسایەتی ونبوو و سڕاوەی خۆمانە، ناسینی ڕۆژئاوا و ناسینی شەپۆلە نوێکانی دونیای کرداری و شارستانیەتی ئەمڕۆشە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك لاوازی و گەندەڵی و لادان و پوچی خۆی بخاتە گەردنی ڕۆژئاوای بێچارە و لەوە بێتاوانمان بکات. ئەم بابەتە خراپ خراوەتەڕوو.

## دوالیزمەی ئەفسانە و یۆتۆپیا:

یەکێکی تر لەم زنجیرە دوالیزمانە کە "شەریعەتی" هەوڵدەدات شوێنی بیرکردنەوە و ژیانی خۆی لە نێوان ئەو دوانەدا دیاری بکات، دوالیزمەی ئەفسانە – یۆتۆپیایە، لە نێوان (ئەو بوەی کە هەیە) و (ئەو "دەبێت"ەی کە نیە). لە نێوان دوێنی و سبەینێدا. ئەسنوردارو و نە هەڵوسراو. هەر مێژوویەك و هەر مرۆڤێك نیازمەندی ئەم ئەفسانە دامەزراوانەیە کە بە یارمەتی ئەوە دەتوانێت نیگا و ڕوانینی پیشانی جیهان و مرۆڤ بدات. بە بۆچوونی "شەریعەتی" ئەفسانەی حەقیقی کە هەروەك واقیعیەت سەیر دەکرێت، هەروەك واقیعیەت دەژی و ڕوونکەرەوەی هێمای ئەو بابەتە بونیادی و بنەڕەتیەیە کە جۆری مرۆڤ لەگەڵیدا دەرگیرە. ئەفسانەکان پێویستن و ویژدانی ئەفسانەسازی مرۆڤ، تەنانەت ئەگەر واقیعیەتی دەرەکی بوونی نەبێت، توانای خوێندنەوەکان و تەفسیرە جیاوازەکان بۆ مرۆڤ فەراهەم دەکات و ئەمانەش دەبنە سەرچاوەی خەیاڵی زاڵ و کاریگەر. لە یۆتۆپیادا بە پێچەوانەی ئەفسانەوە، قسەکردن لە نەبوونێکە کە بوون گریمانە دەکرێت. هەر لەبەرئەم گریمانەشە کە مرۆڤی ڕێنیسانس "خەیاڵکردنی تەقلیدانە" بە "خەیاڵی

داهێنەرانە" بگۆڕدرێت. خەیاڵێك كە هەڵبەتە لەگەڵ واقیعیەتدا رێكدەخرێت. لەم هاتن و چوونەدا لە نێوان ئەمری واقیع و ئەمری خەیاڵیدا گریمانەی ئەوە كراوە فەزایەك لە مومكین فەراهەم ببێت تاكو مرۆڤ "چارەنووسی چاوەڕوانی" سەدەكانی ناوەڕاست بگۆڕێت بۆ ئیرادەیەكی ئازاد و ئومێدەوار كە توانای هەنگاونانی بۆ پێشەوە هەیە. ناشوێن، بەرهەمی سەفەرە و فەراهەمكردنی توانای سەفەر. نیگا و روانینی یۆتۆپی پەیوەستە بە رێبواری كە بۆ شوێنی دیكە دەگەڕێت و لە گەڕانەوەدا روانینێكی رەخنەگرانە بۆ ئەو دۆخەی كە هەیە، پەیدا دەكات. رۆیشتن، تەرككردنی ئەو شوێنەی كە بووە و گەڕانەوە بۆ هەمان شوێن. دروستكردنی توانی بەراوردكردن و هێڵدانان لەسەر روخساری ناتەواوی واقیعیەت. بەڵام ئەو لە قبوڵكردنی چارەنووسی واقیعیەت و ئەو ئەشكەنجەیەی كە هەیەتی، دەپارێزێت، ئەمەش دروستكردنی ئاخود ئاگایی نوێیە لەم واقیعیەتە كوێر و بەستراو و گیراوە. جێگەیەك كە لە نێوان "فەتالیزم" و قبوڵكردنی پێكهاتە و چارەنووسی ئەمری واقیع. ئومێد بەوەی كە مێژوو نەگەیشتۆتە كۆتایی و چ بگا بەوەی هێشتاش دەستی پێنەكرد بێت. مەرجی مانەوە و درێژدان هەر كۆمەڵگەیەك لەوەدایە كە توانای ئەوەی هەبێت بۆ خۆی دۆخی گریمانەیی دروست بكات، بەهێزیان بكات و پێیانەوە پەیوەست بێت. خەونی مرۆڤێكی بێدارە پێناسەی "ئەرستۆ".

پرسیار ئەوەیە كە لە نێوان "ئەفسانە" كە رەگ و ریشەی دێرینەی هەیە و "یۆتۆپیا" كە بەرەو سبەێنێیە، پرۆژە و جۆری ژیانی "شەریعەتی" لە كوێدایە و زیان وبەلاكانی لە بۆچوونی ئەودا لە كوێدان؟ ئافاتی ئەفسانە (mytification)، ئەفسون زەدەیی (mystification) یان بە دەستەواژەی خودی "شەریعەتی"، "استحمار" و بەلاو ئافەتی یۆتۆپیا، لە خودی

پەیوەستبوون و پێویستی بوونی ئەوەیە. کەمکردنەوەی گشتیەتی مرۆیی بۆ شتێکی تەواوی بەستراوە، جێ"ەیەك کە کات تیایدا وەستاوە، جارێکی دی هەمان پرسیاری هەمیشەیی، "شەریعەتی" بۆ خۆدوورخستنەوە لەم دوو ئافەتە چ شێواز و ڕێگەیەك دەگرێتەبەر؟ شێوازی "شەریعەتی" بۆ ڕزگاربوونی لە ئەفسانە و یۆتۆپیا، جیاکردنەوەی بەشی ئەفسانەیە لە ئەفسون "استحمارزدایی"، لە لایەکەوە بە مەرجکردنی "یۆتۆپیا"یە بۆ کات، بۆ ئێرە و هەر ئێستا. بە یارمەتی ئەم دوالیزمەی ئەفسانە و یۆتۆپیایە کە "شەریعەتی" دەیەوێت هەم لە حەسرەت بۆ ئەو کاتانەی لە دەست دەرچوون ڕزگاری بێت و هەمیش نەبێتە قوربانی چارنووس و دۆخی ئەمری واقیع.

## دوالیزمەی ئاگایی ئایدۆلۆژی – ئاگایی ئەکادیمی:

ئەمڕۆ ئیدی هەمووان جەدەلی نێوان "ئەبوعەلی" و "ئەبوزەر" دەناسن و ئەو بەراوردەی کە "شەریعەتی" لە نێوان ئەم دوانەدا ئەنجامی دا. (هەروەها بەراوردەکانی نێوان تاسە و شەوق و هەست، شەڕ و خێر، فەلسەفە و عیرفان، بەزم و ڕەزم و ...هتد)، "شەریعەتی" تاوانبارە بە هەبوونی ڕووگەیەکی ئایدۆلۆژی بۆ حەقیقەت و مەعریفەت و ڕووگەی ئایدۆلۆژی بەمجۆرە پێناسە دەکەن کە بریتیە لە (نیگا و ڕوانینی دوالیزمانە بۆ جیهان (ڕەش – سپی) پیشاندانی خوی دۆست وەکو فریشتە و ئەهریمەنیکردن و بەشەیتانکردنی دوژمن. یەك پارچە سەیرکردن، سیستەم ساز، لایەنگری گۆڕان، ئاراستەگەر، نیگای ئامرازانە بۆ ئاگایی یان حەقیقەت بە مەبەستی کردار. تاك بواری، ئایدۆلۆژیا بە دەستەواژەیەك بریتیە لە سێ ووشە: (سەقف، سیستەم و دووبارەبوونەوە). لەگەڵ ئەوەی لە " شەریعەتی" دەخوێنینەوە کە لە (سەقف، سیستەم و دووبارەبوونەوە) بێزارە.

ئەگـەر ئایـدۆلۆژیا سیسـتەم و سـەقف و دووبارەبوونـەوە بێـت، نـاتوانین لـە "شەریعەتی"دژە ئایدۆلۆژیتر بدۆزینەوە.

ئەوەی کە گومان و دڕۆدۆنگیەکی لەمجۆرە پەسەندە یان نا باسێکی تـرە، بـەڵام مومکینـە. دەکرێـت و هـەر ئـەم کەشـفکردنی رێگـا بـە رووکـەش مومکینانـە بـۆ کەشفکردن و رزگارکردنی سەرزەمینە نوێکان و تێپەڕبوون لە سنوورە جێگیرەکان نیگایەکیان بە ئەو بەخشیوە کە والاّ و کراوەیە، رەفتـاری دژە کلێشـەیی و رۆحـی تەواو ئازاد و بیّ روخسـار و لـە یـەك ووشـەدا دەگمـەن. ئـەزموونێك وای لێدەکات مەزهـەبی بمێنێتـەوە، دەسـت لـە تاکگـەرایی خـۆی هەڵنـەگرێت و گـویّ بـە چارەنووسی گشتی بدات و هەڵبەتە فەراهەمکردنی پلەیەکی لەمجۆرە لە گەلێك لـە پلە و پۆستەکانیش بێبەشی کردوە. بیّ خاوەن بـووە، تـەنها و سـەرگەردان. هـەر بەو جۆرەی خۆی دەیوت: رۆشنبیری ئاوارە. ئاوارەبوونێك نەك میهرەبـان هێنـەر، نەك غەمبار، بەڵکو بە تـەواوی هەڵبـژێردراو. ئـەم ئاوارەبوونـە هەڵبـژێردراوە نـەك تەنها میهرەبان هێنەر نیە، بەڵکو حەسرەت هێنەرە.

"شەریعەتی" ئەم ئاوارەبوونە بە فەزیلەت دەزانێت و پشتی پـیّ دەبەسـتێت و بـە پشت بەستن پێی، داوەری هەموو رۆحەکان و گیانە جێگیرەکان دەکـات، تاوانبـار دەکات. "شەریعەتی" سیاسەتمەدار لەو "ئێمە"یە دەڵێت کـە شـەفافە، قـەڵغانێك بۆ پەنهانبوون و شاراوەبوون بوونی نیـە و "شـەریعەتی" مەزهـەبێك بـە مەزهـەبی عیشق دەگۆرێت کە پەردە نیە، تاکگەرایی دروست ناکات و بێشوناسی ناکـات. لـە مەزهەبێك کە تەنها دوانگەی ئامۆژگاری و وتاردان نیە.

جۆری ژیانە و گرنگتر لە هەموو جۆرێك رەفتار و جۆرێك نیگا و روانینە بـۆ جیهـان و مرۆڤ.

ئەوە پیشانی ئیماندار دەدات کە ڕێگەی ڕزگاری لە دژیەکیەکان، ناسینیانە نەک ئینکاریکردنیان، دروستکردنی پەیوەندییەکی نوێیە نەک نەفیکردنی یەکێکیان بە سوودی ئەویتریان.

"شەریعەتی" بۆ دۆزینەوەی وەڵامێك بۆ پرسیاری تراژیك، من کامم؟ نە ڕێسا و یاسای کارێك دەردەکات و نە نموونە، بەڵکو ڕێگە و شێوازێك بەدەستەوە دەدات، توخمی تەفسیر و ڕاڤەکردن نەك پێکهاتەی خەواندن و موزایك ئاسا کە پەیوەندییان بەیەکترەوە نیە و شتی نا پەیوەستن. دەستەواژەی "مالینوسکی": فەراهەمکردنی دونیایەك کە لە دوو توێی حەقیقەتی خێر و جوانی توانای هاونشینی نێوان مەعریفەت، ئەخلاق و هونەر فەراهەم بێت... (لەوێدا من و عیشق و خودا دەست دەخەینە ناو کارێکەوە تاکو جیهان سەر لەنوێ دروست بکەینەوە... بەهەشتێك کە تیایدا درەختەکان درەختی قەدەغەکراون، جیهانێك کە دەستەکانی هونەرمەندی ئێمە ئەندازیاریەتی.) "هبوط، لاپەڕە ١٣٤".

سەرچاوە: ڕۆژنامەی "شەرق"، ساڵی (١٣٨٨).

## بەرهەمەکانی وەرگێڕ:

## چاپکراوەکان:

١- دیوی ئەخلاقی ڕێکخراوە مەدەنییەکان. ئامادەکردن، ساڵی ٢٠٠٧.

٢- ئێمە لەکام جیهاندا دەژین؟ ن: د. عبدالكريم سروش. وەرگێران، ساڵی ٢٠٠٧.

٣- دەفتەرە خۆڵەمێشییەکان. د. علی شریعتی، وەرگێران، چاپی دووەم، ٢٠٠٨.

٤- عیشق گەورەتر لە عیشق! نوسین، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٥- عەقڵ و ئیمان.ن: د.عبدالكريم سروش. وەرگێران، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٦- شارناسی و ....، تەحسین حەمەغەریب. پێشەکی و ئامادەکردن، ساڵی ٢٠٠٩.

٧- چیەتی مەرگ؟ د.عبدالكريم سروش، ئامادەکردنو وەرگێران، ساڵی ٢٠٠٩.

٨- ئەرستۆ، ن:پ.ستراتێرن، وەرگێڕان، ژیانی فیکری و فەلسەفی، ساڵی.٢٠١٠

٩- نەتەوەناسی..، ن. تەحسین حەمە غەریب، ئامادەکردن. ساڵی ٢٠١٠.

١٠- سوکرات و ئەفلاتۆن، کۆمەڵە ووتە. چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١١.

١١- ئایا ئادەم نەیبینی؟ ن. جبران خەلیل جوبران. وەرگێڕان،ساڵی ٢٠١١.

١٢- سوننەت و مۆدێرنە، د.سروش، د.حسێن نەصر، نووسین و وەرگێڕان،.٢٠١١

١٣- بۆچی ترس لە مەرگ؟ ن: مهاتما گاندی. وەرگێران، چاپی دووەم، ٢٠١٢.

١٤- ووتەکانی ژیان، ئامادەکردن و وەرگێڕان. چ ٢، ساڵی ٢٠١٣.

١٥- عەقڵ و عیشق، ن. د.عبدالکریم سروش، وەرگێڕان، ٢٠١٣.

١٦- ئەخلاق و مەعنەویەت، کۆمەڵە نووسەر، موسعەب ، فاتیمە ئەدهەم، ٢٠١٣.

١٧- وتەکانی عیشق، کۆمەڵە نووسەر، ئامادەکردن و وەرگێڕان، ٢٠١٣.

١٨- ئیسلامی کوردی و.. تەحسین حەمەغەریب، ئامادەکردنی: موسعەب ئەدهەم، ٢٠١٣.

١٩- موناجاتنامە، خواجە عەبدوڵلای ئەنساری، ئامادەکردن و وەرگێڕان. ٢٠١٣.

٢٠- ئەخلاق و فەزیلەت، ن. د.ئارەش نەراقی، وەرگێڕان، ٢٠١٣.

٢١- مرۆڤ، ن. د. عەلی شەریعەتی، وەرگێڕان، چاپی سێیەم،ساڵی ٢٠١٤.

٢٢- وتەکانی (سوکرات، ئەفلاتۆن،ئەرستۆ)(کوردی-ئینگلیزی)،ئا، وەرگێڕان، ٢٠١٤.

٢٣- نزا، د. عەلی شەریعەتی، وەرگێڕان، ٢٠١٤.

٢٤- شەریعەتی، بیرمەندی ئازادی. ئامادەکردن و وەرگێڕان، ٢٠١٥.

## ئەو بەرهەمانەی لەبەردەستدان:

١- ئەدەبی قودرەت، ئەدەبی عەدالەت، ن. د.عبدالكريم سروش، وەرگێڕان.

٢- فیکری ئاسکی غەمناك، ن.د. سروش دەباغ، ئامادەکردن و وەرگێڕان.

٣- فەلسەفەی عەدالەت. ن: تەحسین حمەغریب، وەرگێڕان.

٤- گەورەتر لە ئایدۆلۆژیا، ن. د.عبدالکریم سروش، وەرگێڕان.

٥- راپۆرتێك بۆ خاکی یۆنان. ن: نیکۆس کازانتزاکیس، وەرگێڕان.

٦- ئایینەکانی چین و یابان. وەرگێڕان.

٧- فیکر و فەلسەفە، کۆمەڵێك وتاری فیکری و فەلسەفی.

٨- عیشقنامە، لێکۆڵینەوە.

٩- ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاق، لێکۆڵینەوە.

١٠- نەتەوەناسی، وتار و گفتوگۆ.

١١- فەلسەفە چیە؟ فەیلەسوف کێیە؟ وتار، وەرگێڕان.

١٢- نەوای نەی، لەبارەی هزر و ژیانی مەولانای رۆمییەوە، نووسین.

بێجگە لە نوسین و ئامادەکردن و وەرگێڕانی چەندین بابەتی فیکری و فەلسەفی و ئەدەبی و لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ لەساڵی (١٩٩٧)ەوە تاکو ئێستا بەبەردەوامی لە زمانەکانی (فارسی و عەرەبی) لە گۆڤارەکانی "هەژان، چاوی هەژان،

ئێرانناسی، ئەمریکاناسی، سەردەم، زانستی سەردەم، هەورامان، هێشتا، پەیامی راستی، سۆسیۆلۆژیا، لڤین، رامان، کەوانە، شرام، کۆچ، نووسین، ئایندەسازی، پەنجەرە، روون، سەرچاوە" هەروەها رۆژنامەکانی "خەبات، یەکگرتوو، کوردستان راپۆرت، ئاوێنە، داهێنان، کوردستانی نوێ، ئاسۆ، کۆمەڵ، ئایندە، ئایندەسازی، ژیانەوە، خورماڵ..."